

# گرنگترینی ئەو ڕووداوانەی که له مانگی رەمەزاندا روویانداوه

انور احمد مصطفى

هەولێر

٢٠١١ز

# گرنگترین ئەو ڕووداوانەی
# کە لە مانگی ڕەمەزاندا رویان داوە

ئامادە کردنی

انور احمد مصطفی

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی پەرتووك : گرنگترین ئەو ڕووداوانەی کە لە مانگی ڕەمەزاندا ڕوویان داوە
ئـامادە کردنی: انور احمد مصطفى
بابەت : مێژووی
نۆرەی چـــاپ: یەکەم ساڵی ۲۰۱۱
تیـــــــــــراژ: ۱۰۰۰ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (757) لە (2011) پێدراوە







بسم الله الرحمن الرحیم

**پێشەکی:**

**مـانگی رەمـەزان مـانگی پاڵاوتـەکردنی دڵ و دەرون و سوڵح کردنـە لـە خواو زاڵ بوونـە بەسـەر نـەفس وئارەزوەکـان دا، بۆیـە ئەگـەر بمانـەوێ مـانگی رەمـەزان گۆڕانکـاری ریـشەییمان تێـدا درووسـت بکـات و دوای رەمەزانیش بەردەوام کاریگەری ئـەو قوتابخانـە پەروەردەییـەمان پێـوە دیار بێت پێویستە پێش هەمووشتێك جڵەوگیری نەفسی خۆمان بکەین و بەسەریا زاڵ بین تا بتوانین بەختەوەرو ئاسودە بین لـە ژیانمانـدا لـە روی ئیمـانی و هەڵـسوکەوت و خێـزان داری و کۆمەڵایـەتی و هتـد...، بێگومان ئەم گۆڕانکاریە ریشەییە تاکە رێگای سەرکەوتو بـوونی تـاك و کۆی موسڵمانانە لە مەیدانی کرداردا هـەر ئەمەیـشە وادەکـات جـارێکی تریش ئوممەتێکی خـەم خـۆر و دڵـسۆز و خزمـەت گوزار و داهێنانکـار پیـشانی هـەموو جیهـان بدرێتـەوە و هـەموو سـەرکەوتنەکانی مێـژوی ئیـسلامی دووبـارە ببنـەوە. (بـەدر و رزگـارکردنی مەککـە و حونـەین و تەبوك و حتتین و عەینجالوت و هتـد...، ئائەمەیـە هـەنگاوی چاکسازی کە پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵانی لەسەر پـەروەردە دەکـرد تـا هەریەکـەیان شۆڕشێك بەرپا بکـات، بـێ روخـان و بـێ سـتەم کـردن، بـەڵکو لـە پێنـاو ئاوەدانی و دادپەروەری و رزگاری و چاکەکاریدا، تـا مرۆڤایـەتی بـەرەو ئاسودەیی و ژیان خۆشی دونیا و قیامەت ببرێن.**

ئازیزەکانم، هەموو ساڵێك کە مانگی پیرۆزی رەمەزان دێتەوە هەندێك لەخەڵکی یادی کۆمەڵێك بابەتی تەقلیدی دەکەنەوە کە لای ئەوان بۆتە خاڵی نەگۆڕی ئەو مانگە، لەوانە: بابەتی سەرکەوتنەکانی مانگی رەمەزانە کە زۆرجار خاڵی پێچەوانە ونێگەتیفی تێدا دەبینرێت، وەکو شکستی موسڵمانان لە هەندێك لە شەڕو جەنگەکاندا کە لە مێژودا بە ئاشکرا دیارەو دەبینرێت، لەبەر ئەوە پێویستە ئێمە ئەوەی کە جەختی لەسەر دەکەینەوە خۆ پەروەردەکردن بێت بە ئیمان و رەوشت بەرزی هتد.. لە هەمان کاتدا سود لە روداوە مێژوییەکان وەربگرین لە پێناو باشترکردنی ژیانی داهاتومان لە روی ئیمانی، رۆشنبیری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی، ئابوری و ... هتد. بۆ ئەو مەبەستە بەپێویستم زانی لێرەدا ئاماژە بە گرنگترینی ئەو روداوە مێژوییانە بکەم کە لە مانگی پیرۆزی رەمەزاندا رویاندا بە ئومێدی ئەوەی هەمووولایەك سودی لێ ببینین.

انور احمد مصطفى

هەولێر ٢٠١١ ز







دوعای ڕۆژی یەکەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللّهُمَّ اجْعَلْ صيامي فيهِ (في رمضان) صيامَ الصّائمينَ و قيامي فيهِ قيامَ القائمينَ ، و نَبِّهْني فيهِ عَن نومةِ الغافِلينَ ، وهَب لي جُرمي فيهِ يا الهَ العالمين ، و اْعْفُ عَنّي يا عافياً عَن المذنبين.**



**ی ڕەمەزان**

* دەرگاکانی بەهەشت والآدەکرێت و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیاتینەکان کۆت و زنجیر دەکرێن.

پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) دەفەرموێ: (اذا دخل رمضان فتحت ابواب الجنة وغلقت ابواب جهنم وسلسلت الشياطين) (متفق عليه). واتە: کاتێك مانگی ڕەمەزان دێت دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکان کۆت و زنجیر دەکرێن و دەبەسرێنەوە.

* هاتنە خوارەوەی کتێبی (صحف) بۆ ابراهیم پێغەمبەر (عليه السلام) .

لەیەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزاندا کتێبی (صحف) دابەزیوە بۆسەر ابراهیم پێغەمبەر (عليه السلام).

* لە(١)ی مانگی ڕەمەزاندا موسڵمانان بە ڕۆژوو بوون، لە ڕۆژی یەك شەممەی یەکی مانگی ڕەمەزاندا لە ساڵی(٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (٢٦) شوبات ساڵی(٦٢٤ ز) بۆ یەکەم جار موسڵمانان بە ڕۆژوو بوون. وتراویشە لە ڕۆژی دووشەممەی (١)ی شەعبانی ساڵی دووی هیجری ڕۆژوو لەسەر موسڵمان فەرزکرا.




* شاری (ناکازاکی) یابان خڵتانی خوێن دەکرێت:



لە (١)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٦٤ك) بەرامبەر بە (٩)ی ئابی ساڵی (١٩٤٥ز) شاری (ناکازاکی) یابانی لەلایەن ئەمریکاوە بە قومبەڵەی زەڕی لێی دراو خاپور کراو بەسەدان ئینسانی تێدا کوژرا کە بە (١٨) هەزار کەس مەزەندە دەکرا.

* بۆیەکەم جار مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) ئاگری تێبەر بوو:

لە (١)ی ڕەمەزان و ڕۆژی هەینیدا مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە ئاگری تێبەر بوو لەو کاتەی کە خزمەت گوزاری مزگەوت بۆ هەندێك پێداویستی چوبووە ناو کۆگا (مخزن)ی مزگەوتەکە بۆ ئەومەبەستە لەبەر تاریکی زورەکە چرایەکی داگیرساندبوو پاشان چراکەی لە کۆگاکەدا لەبیر کردبوو، ئەوەش بوو بوە هۆی کەوتنەوەی ئەو ئاگرەو سوتانی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەبوو ئاگر لە ناو کۆگاکەوە بەرز بوەوە و گەیشتە سەقفی مزگەوت و لەوێشەوە تەشەنەی کرد تا هەموو لایەکی مزگەوتی گرتەوە، خەڵکی مەدینە





هەموو هێزی خۆیان بەکار هێنا بەڵام نەیان توانی کۆنترۆڵی بکەن، لە ئەنجام دا مزگەوت بەتەواوی وێران بوو و ڕوخا. دوای ئەوە هەندێك لـە خەلیفـە و مـیرو دەسەڵات دارە موسڵمانەکان هاوکاری دروست کردنەوەی مزگەوتەکـەیان کـرد لەوانە:




١- خەلیفە (المعتـصم باللـه) دەسـەڵات داری بەغـداد، کـە کۆمـەڵێکی زۆر کۆمەك و تەنانەت وەستا (بنا) یشی بۆ ناردن.

٢- المنصور (نورالـدین)ی علـی کـوڕی مغرایبـك الـصالحی، دەسـەڵات داری میصر.

٣- مظفر شمس الدین یوسف ی کوڕی منصور، دەسەڵات داری یەمەن.




چەند خەلیفەیەکی تریش هاوکاریان کرد، ئەوە بوو لەساڵی (٧٥٥ك) دەست کرا بە دروست کردنەوەی مزگەوتەکەو ساڵی (٨٩٩ك) و کۆتایی سەدەی (٩)ی کۆچی مزگەتەکە بەتەواوی چاك کرایەوە.

* گەیشتنی فتوحاتی ئیسلامی بۆ میصر:



لە سەرەتای مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٢٠ی کۆچی بەرامبەر بە (١٣)ی ئابی (٦٤١ ز) لەسەردەمی پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب) (ﷺ) فتوحاتی ئیسلامی گەیشتە وڵاتی (میصر)، لەسەر دەستی سەرکردەی لێهاتوو (عمرو)ی کوڕی (عاص) (ﷺ) بەشێوەیەك میصر بوویە بەشێك لەخاکی موسڵمانان .







- گەمارۆدانی قەلآی بابلیۆن:



لەیەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٢٠)ی کۆچی بەرامبەر بە ١٣ی ئابی (٦٤١) ز سەرکردەی ئیسلامی (عمرو)ی کوری (عاص) گەمارۆی قەلآی (بابیلۆن)ی دا پاش ئەوەی لە ڕێگەی دا سەربازەکانی ڕۆم بەربەستیان درووست کرد و بەرگریان کرد.

- سەرەتای دەستپێکردنی فەتح و سەرکەوتنی موسڵمانان لە ئەندەلس:

لە ١ی ڕەمەزانی ساڵی (٩١)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧١٠)ی زاینی موسڵمانان بە سەرۆکایەتی (طریفی کوری مالیکی بەربەری) دابەزینە سەرکەنارە دەریاکانی وڵاتی (ئەندەلوس) و سەرکەوتن بەسەر بەشێك لە باکوری ئەو

ولاتەدا، ئەوەش بووە سەرەتای دەست پێکردنی سەرکەتنی موسلمانان لە ئەندەلس دا، بۆ ئەو مەبەستە (موسای کوری نصیر) هەلسا بە ناردنی (طریفی کوری مالیك) بۆ پشکنینی رێگە تابتوانن بەئاسان ترین شێوە دەست بگرن بەسەر ئەندەلوس دا.

*سەحنون لەدایك بوو:

لە (١)ی رەمەزانی سالی (٢٠ ك) بەرامبەر (١٣) ئابی (٦٤١ ز) پێشەوا (سەحنون) لە (قەیرەوان) لە دایك بوو.

*ابن سینا کۆچی دوایی کرد.

لە (١) رەمەزانی سالی (٢٠ ك) بەرامبەر (٦٤١ ز) – زاناو فەیلەسوفی ناوداری جیهانی ئیسلامی (حسین ی کوری عبدالله شرف الملك)ی ناسراو بە (ابن سینا) لەتەمەنی (٥٧) سالی و بەنەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

ابن سینا لە سالی (٥٨٤ ز) لەدایك بووە و لە ناودارترین زانایانی سەردەمی خۆی بووە لە بواری چارەسەرو زانستەجیاجیاکاندا. وە سەرکەتو ترین فەیلەسوفی سەدەکانی ناوەراست بوو، نوسراوەکانی لە زۆرێك لە زانکۆکانی ئەوروپا بە وانە دەوترێنەوە. ابن سینا ناوی باپیری سینا بووە هەر بەو ناوەشەوە بانگ کراوە و ناوبانگی دەرکردووە، لە تەمەنی (١٠) سالی دا قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، شارەزایی لە زۆرێك لە زانستەکاندا هەبووە، یەکەم کەسە کە باسی پیس بوونی هەوای کردبێ، سەرەتاش لە زانستی (ریاضیات و فقە و منطق) دەستی پێ کردووە و پاشان روی کردۆتە زانستی (الطب) (چارەسەر) لەسەر دەستی زانای ناودار (عیسی کوری یحیی) زانستی (الطب)ی وەرگرتووە و بوەتە باشترین چارەسەرکاری نەخۆشیەکان یەکەم کەسە کە باسی نەخۆشی سیل







و چارەسەری ئـەو نەخۆشـیەی کـردووە، ئەوروپیـەکان پێـی دەڵـێن (ئـەمیری پزیشکان)و لەیەکێك لە زانکۆکانی فەڕەنساشدا پەیکەری ئەو زاتەیان دروست کردووە، ئەمەش لە پێش تەمەنی(١٨) ساڵی دا، جگەلەوەش لە بواری نوسـین دا چەدین کتێبی نووسیوە کە ژمارەیان دەگاتە (٢٥٠) کتێب و نووسـراو، لـە دیارترین نوسراوەکانی (القانون ، الفصول ، الادوية العقلية ، عيـون الحكمـة ، الاشارات والتنبيهـات ، الانـصاف )، ابـن سـينا تـوانی گيـانی (امـير بخـاری السامنی نوح - ابن منصور ) لە مردن رزگار بکات دوای ئـەوەی کـە توشـی نەخۆشیەکی کوشندە بوبوو. ابن سينا دەڵـێ: مـن زۆر سـودم وەرگرتـووە لـە ئایەتی (وَكَذالِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وسَطا)، لەوئايەتە پەرۆزەوە فێربووم کە هـەموو شتێك ئەمسەرو ئەوسەری هەیە (وسط)، بەگەڕان بەدوای (وسـط)دا سـودێکی زۆرم بینی و ئەنجامی باشم بەدەست هێناو ئەگەر شتێکم لێ عاسی ببوایە دوو رکات نوێژم دەکردو دوعام دەکردو دەمگوت ئەی ئەو خوایەی کە منت کردووە بە ئوممەتی (محمد) (ﷺ) کە ئومەتی (وسط)ە هیدایەتم بدە.

* لە دایك بوونی شەکیب ئەرسەلان.

لـە ١ی رەمـەزانی سـاڵی (١٢٨٦) کۆچـی بەرامبـەر بـە (٢٥)ی کـانونی یەکەمی(١٨٦٩) زاینی پیاوی ناوداری جیهانی (شەکیب ئەرسـەلان) لـەدایك بوو،ئەمیری ناوچەی (بیان) بوو جگە لەوەش یەکێك بوو لە بـانگ خوازەکـانی یەکێتی عەرەبی و یەکەم کەس بوو داوای پێکهێنانی گردبونەوەی عەرەبی کرد (جامعة عربية) وە یەکێك بوو لەدیارترین ئاڵابەدەست و مەشـخەڵ دارەکـانی چاکسازی و سەرکردەیەکی دیاری رزگاری نیشتمانی بوو لـەدژی داگیرکـار، وە




خاوەنی زۆرترین ژمارەی نوسین و بابەت و وتاری جۆراوجۆر بوو، جگەلەوەش نوسەری کتێبی (الحلل السندسية) و (مێژوی غەزەواتی عەرەب)ە.

- هێرشی ئیسرائیل و جولەکەی خوێن ڕێژ بۆ سەر خواروی کەرتی غەززە.





لە(١)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٥)کۆچی بەرامبەر بە ١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤ز) جولەکەی دوژمنکاری ئیسرائیلی هێرشێکی کوێرانەی کردە



**سەر باشوری کەرتی غەززە و بۆماوەی (١٧) ڕۆژ بەردەوام بوو ئەم هێرشە درندانەیە بووە هۆی شەهید بوونی زیاترلە (١١٠) کەس کە لەنێوانیاندا (٣٠) منداڵ هەبوو، جگەلەوەی بووە هۆی برینـدار بـوونی (٤٠٠) کەسی تر کە نیوەیان لە منداڵان بوون.**

لە کتێبی (بستان الفقراء و نزهة القرار) لە نووسینی امام (صالح عبدالله الکتامی) هاتووە دەڵێت :
پرسیار کرا لە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالب (کرم الله وجهە) لەبارەی نوێژی تەراویح لە مانگی ڕەمەزاندا، ئەویش وتی: خۆشی لەوکەسەی کە خوای گەورە نوێژی تەراویحی ئەو مانگەی پێ دەبەخشێ و بە نسیبی دەکات، چونکە هەرکەسێك شەوی یەکەمی مانگی ڕەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە ئەوا ئەوکەسە لە گوناهەکانی پاك دەبێتەوە هەر وەکو چۆن منداڵێك بەپاکی دێتە دونیا و لەدایك دەبێت...

(پێشەوا علی)

دوعای رۆژی دووەمی مانگی رەمەزان:

اللّهُمَّ قَرِّبْني فيهِ (إلى رمضان) إلى مَرْضاتِكَ ، و جَنِّبْني فيهِ مِنْ سَخَطِكَ و نَقِماتِكَ ، و وَفِّقْني فيهِ لِقِرائَةِ آياتِكَ ، بِرَحْمَتِكَ يا أرْحَمَ الرّاحِمين .



ی

رەمەزان

* لە (٢)ی رەمەزانی ساڵی (١١٩١ ز) سوڵتان (صلاح الدین ئەیوبی ) هێرشی کردە سەر شاری (عەسقەلان) دوای ئەوەی کە دانیشتوانەکەی بە فەرمانی سوڵتان شارەکەیان چۆڵ کرد، پاشان تەواوی شارەکەی روخاند و دیواری دەوری شارەکەیشی تەفرو توناکرد، ئەوەش لە ترسی ئەوەی



ئەوەکو خاچ پەرستەکان دەستی بەسەردا بگرن و دانیشتوانەکەی دەستگیر بکەن و ئەوەش بکەنە هۆکارێك بۆ گرتنی (بیت المقدس)، لە پێش دەست پێکردنی







روخاندنی شارەکەدا سولتان (صلاح الدین) وتە بەناوبانگەکەی وت کە دەڵێت : سوێند بە خوا مردنی هەموو منداڵەکانم بەلاوە ئاسایی ترە لە روخاندنی بەردێکی ئەم شارە، بەڵام چی بکەم ناچارم ئەوە بکەم چونکە مەسەلەتی ئیسلام و موسڵمانانی تێدایە.

*فەتح کردنی مەغریبی ناوەڕاست:

لە ٢ی مانگی رەمەزانی ساڵی ٢٨ی کۆچی موسڵمانەکان لە باشوری ئەفریقا روبەرووی دوو هێزی گەورەبوونەوە کە ئەوانیش بریتی بوون لە رۆم و بەربەریەکان، گەورەی بەربەریەکان کە ناوی (کاهینە) بوو توانی بەرامبەر هێزی موسڵمانەکان بوەستێتەوە و بەر پەرچیان بداتەوە، ئەوە بوو بۆ ماوەی چەند ساڵێك شەری لەگەڵ موسڵمانەکانداکرد، سەرکردەی موسڵمانەکان لەو شەرەدا (زهێری کوری قەیس) بوو، نەیتوانی سەرکەوتوویێت بەسەر کاهینەدا، تائەوە بوو سەرکردەی ناوداری موسڵمانان (حسانی کوری نعمان) هات و توانی هەموو وڵاتانی مەغریب فەتح بکات و بیکاتە ژێردەستی موسڵمانان و پاشان رووی کردە ناوەندەکان (الاوسط)ەکانی مەغریب و لەوێدا گەیشت بە هێزەکانی کاهینە و توانی گورزێکی کاریگەریان لێبدات و شکستیان پێ بهێنێت.

* شەڕی بلاط الشهداء

لە ٢ی رەمەزانی ساڵی (١١٤ ك) بەرامبەر بە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٧٣٢ز) شەڕی (بلاط الشهداء) هەڵگیرسا لە نێوان موسڵمانەکان بە سەرۆکایەتی (عبدالرحمان ی غافیقی) و فەرەنجەکان بە سەرۆکایەتی (شارل مارتل) لەفەرەنسا و لە ناوچەیەك کە کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری (تۆر) و (بواتییە)، ئەم شەڕە ماوەی (١٠) رۆژ ی خایاند و بەشەهید بوونی (غافقی)





کۆتایی هات، پاشان موسڵمانەکان لەبەر ئەوەی هیچ جۆرە هاوکاری و کۆمەکیەکیان پێنەگەیشت ناچار بوون لەشەوێکی تاریکدا پاشەکشە بکەن و پەنا بەرنە بەر شاخی (البرانس) لە باشوری (ئەندەلوس).



* هێرشی ئاسمانی بۆ سەر چەند ناوچەیەکی دەوروبەری دهۆك:

لە(٢)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٠٧ك) بەرامبەر بە (١٩٨٧/٥/١ز) هێزەکانی ڕژێمی بەعس هێرشێکی ئاسمانی توندیان کردە سەر چەند ناوچەیەکی دەورو بەری شاری دهۆك.

* گرتنی دورگەی (قبرص)

لە ٢ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٢٩ی کۆچی موسڵمانەکان بە سەرۆکایەتی هاوەڵی بەڕێز معاویەی کوڕی ابی سفیان (ﷺ) توانیان دەست بگرن بەسەر دورگەی (قبرص) دا، لەسەردەمی خەلیفە (عثمان ی کوڕی عفان) (ﷺ) دا.

* ڕوخانی دەوڵەتی ئەمەویەکان و درووست بوونی دەوڵەتی عەبباسی:

لە (٢)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٢ ك) بەرامبەر بە (١٣)ی نیسانی ساڵی (٧٥٠م) (عبدالله باوکی عەباس) دەستی گرت بەسەر دیمەشق دا و کۆتایی بە دەستەڵاتی ئەمەویەکان هێناو دەوڵەتی عەبباسی درووست کرد.

* شاری قەیرەوان درووست دەکرێت:




لە ٢ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٦٧٠ ز) دەست کرا بە دروستکردنی شاری قەیرەوان بە سەرپەرشتی ڕزگارکەری ئەوشارە (عقبەی کوری نافع) ڕەزای خوای لێبێت.



قەیرەوان وشەیەکی فارسی یەو لەسەرەتادا (کاراوان) بووە و بەواتای (شوێنی دابەزین) دێت، شایانی باسە قەیرەوان لە مێژوودا بە زانست و زانیاری و شەرع زانەکانی ناسراوە. لە گرنگترین شوێنەوارە دیارەکانی قەیرەوان کە تائێستاش هەر ماون.

١- مزگەوتی (عقبەی کوری نافع ).

٢- مەرقەدی هاوەڵی بەڕێز (ابی رمعەی بلوی) ڕەزای خوای لێ بێ.

٣- حەوزی (الاغالبة).

* لە دایك بوونی مێژو نووس و فەیلەسوفی ناوداری ئیسلامی (ابن خلدون).

لە (٢) ڕەمەزانی ساڵی (٧٣٢ ك) بەرامبەر بە (٢٧)ی ئایاری ساڵی (١٣٣٢ ز) مێژو نووسی ناوداری جیهانی ئیسلامی (ابن خلدون) لە دایك بوو.

* دەست گرتن بەسەر جەزیرەی (کریت)دا




لە (٢)ی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٢٣٩ك) بەرامبـەر بـە (١٨٢٤ز) میـصریەکان توانیان دەست بگرن بەسەر جەزیرەی (کریت)دا.[1]

* لە (٢)ی ڕەمەزانـدا سـوڵتان (ناسـری کـوری قـلاوون) تـوانی گـەورەترین سەرکەوتن تۆمار بکات لەو کاتەی کە مەغۆلەکان ویستیان هێرش بکەنە سەر (حەلەب) سوڵتان (ناسر) کە تەمەنی گەشتبوە ١٨ ساڵ بە خۆیو زیاتر لە ٢٠٠ هەزار کەسەوە لە حەلەبەوە دەرچوون بۆ بەرەنگار بونەوەی جەیشی مەغۆل، لە شوێنێك کە پێی دەوترا (مرج راهط) شەرێکی گەورە لە نێوانیاندا بەرپا بوو،لە ئەنجامدا مەمالیکەکان توانیان سـەرکەوتنێکی گـەورە تۆمـار بکـەن بەسـەر مەغۆلەکاندا، بە شێوەیەك کە (٣/١)ی جەیشی مەغۆلەکان بە دیل گیران لـە لایەن مەمالیکەکان، ئەوەبو کە دەنگوباسی روخانی مەغۆلەکان گەیشتەوە بە (محمود غازان)ی سوڵتانی مەغۆلەکان لە خەفەتا مرد.

* لە (٢)ی ڕەمەزانی (٢٧)ی ئایـاری سـاڵی (١٣٣٢ ز) – زانـای نـاوداری ئیسلامی (عبدالرحمن کوڕی خلدون) لە تونس و لە بنەماڵەیـەکی ئەندەنوسـی چاوی بە دونیا هەڵهێنا. ابن خلدون لە ماڵێکی پڕ لەزانست دا گەشـەی کـردو پەروەردە بوو، مامۆستای یەکەمی ابن خلـدون بـاوکی بـوو دوای ئـەوەی کـە قورئانی پیرۆزی خوێند پاشان شارەزاییەکی باشی لە (قـرا أت الـسبع) پەیـدا کرد، دوای ئەوە دەستی کرد بە خوێنـدنی (تفـسیر و فقـه و حـدیث) لـە سـەر مەزهەبی پێشەوامالك، پاشان دەستی کرد بە خوێندنی (نحو و زمان و منطق و

[1] هەندێك پێیان وایە کە ئەم روداوە لە ٣ی ڕەمەزاندا رویداوە.






فەلسەفە و زانستە سروشتیەکان) لە سەر دەستی ناودارترین زانای تونس. لە ساڵی (٧٥٣ ك) چو بۆ شاری (فاس) پاشان کۆچی کرد بۆ (غرناطة) پاشان گەڕایەوە تونس تا ئەوکاتەی چوو بۆ حەج لە پاش گەڕانەوەی رووی کردە وڵاتی میسر، لەو کاتەدا سوڵتان (بەرقوق) سەرپەرشتی میسری دەکرد، سوڵتان ڕێزێکی زۆری لێ گرت و کردی بە وانە بێژ لە قوتابخانەی (قمحیە) هەرلەو ساڵەشدا کرا بە قازی لە مەزهەبی پێشەوا مالیك دا بۆ ماوەی ٢٣ ساڵ و شەش قۆناغ قازیایەتی لە میسردا کرد.

*سیخوڕی دەکات و بەریتانیا هەڵدەخەڵەتێنێ:

(کیم فلیپی) کە پیاوێکی تەمەن (٣٠) ساڵان بوو توانی بەریتانیا بخەڵەتێنێ و سیخوڕی بۆ سۆڤیەت بکات بەسەر بەریتانیاوە، شایانی باسە ئەم پیاوە ماوەیەك سکرتێری یەکەمی باڵیۆزی بەریتانیا بووە لە (واشنتۆن)، تا دواجار گەیشتە پلەی پاڵێوراو بۆ سەرۆکی دەزگای سیخوڕی بەریتانیا، ئەوەبوو لە (٢)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٨٢ك) بەرامبەریە (١٩٦٣/١/٢٧ز) پێی زانراو ئەویش لە لوبنانەوە بەرەو سۆڤیەت رای کرد.[١]

* لە (٢) ی ڕەمەزان جەیشی پۆلۆنی بە پاڵپشتی چەند یەکەیەکی تورکی توانیان گورزێکی کاریگەر لە هێزەکانی ئەڵمانیا بدەن لە شەڕی (کارفو)دا کە تێیدا (الارشیدق) ی ئەڵمانی (سیجموند) بە دیل گیرا. هۆکاری هەڵگیرسانی

---

[١] سەرچاوە : سۆزمای دیدە – عادل شاسواری




ئەم شەڕە بریتی بوو لەوەی کە ئەڵمانیەکان دەیان ویست دەست بگرن بەسەر لوتکەی دەسەلاتی پۆڵۆنیا کەلە پاڵ دەوڵەی عوسمانی دا بوو تاساڵی ۱۵۹۲ز.

هەرکەسێك شەوی دووەمی مانگی رەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە، خوای گەورە لە دایك و باوکی ئەوکەسە خۆش دەبێت...

(پێشەوا علی)

هەرچی زۆرتر دەرس لە روداوەکانی رابردو وەر بگرین، داهاتویەکی باشتر و پرشنگدارترمان دەبێ.

(وتە)

**دوعای ڕۆژی سێ یەمی مانگی ڕەمەزان:**

**اللّهُمَّ اُرْزُقْنِي فِيهِ (في رمضان) الذِّهنَ والتنبيهِ، وباعدني فيه من السفاهة والتمويه، واجعل لي نصيبا من كل خير تنزل فيه بجودك يا اجود الاجودين.**



**ی**

**ڕەمەزان**

* ڕووداوی تەحکیم: واتە پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ کۆتایی هێنان بەو ناکۆکیەی کە لە نێوان پێشەوا عەلی و پێشەوا موعاویە دا هەبوو ڕەزای خوایان لێبێ.

لە (٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣٧ ك) بەرامبەر بە (١١)ی شوباتی (٦٥٨ ز) ڕێککەوتنێك کە پێی دەوترا تەحکیم لەنێوان هەریەك لە پێشەوا (علی کوری ابوطالب) و پێشەوا (معاویەی کوری ئەبوسوفیان) ڕەزای خوایان لێبێ،لە دوای روداوی (جمل) کە لە نێوان چەکدارانی پێشەوا علی و بنی ئومەییەو دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە و طلحە و زوبێر رویدا، وە دوای روداوی (صفین) کە لەنێوان چەکدارەکانی پێشەواعلی و معاویەدا رویدا.

*فاطمە ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد:

لە ٣ی مانگی ڕەمەزاندا حەزرەتی (فاطمە)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد کە یەکەم کەس بوو لە (ئال وبەیت) لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) وەفات بکات، تەمەنی (٢٩)ساڵان بوو.

* مردنی مەروانی کوڕی حەکەم.

لە (٣)ی ڕەمەزانی ساڵی(٦٥ك) بەرامبەر بە (١٤)ی تشرینی دووەمی (٦٨٣ز) مەروانی کوری حەکەم کۆچی دوایی کرد، کە بناغە دارێژەر و







بنیادنەری دەوڵەتی ئەمەوی دوهەم بوو، جگە لەوەش خاوەنی چەندین ئینجازاتی شارستانی بوو،وەکو دیاری کردنی کێشانەو پێوانە.

* لە (٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤١٨ك) (أبو طاهر جلال الدولة) سوڵتانی (بني بويه)، گەمارۆی شاری بەغدادی دا دوای ئەوەی خەلیفە (قادر) کە ئەمیری ئەوکاتەی بەغداد بوو چووەدەرەوەی شاری بەغدا بۆ بەرپەرچ دانەوەیان بەڵام ئەو دەست گیری کردو لای خۆی هێشتیەوە، ئەوەبوو (جلال الدولة) دەستی بەسەر بەغداد دا گرتوو لەوێ مایەوەو خوتبەیەکیشی بۆ خۆی دانا لەناو شاری (بەغداد) دا.

* لە (٣)ی مانگی ڕەمەزان ساڵی (١٩٨٨/٤/٢٠ز) ڕژێمی بەعس هێرشێکی بەرفراوانی کردە سەر ناوچەکانی شەقڵاوە و ڕەواندوز و ئەنفالی کردن.

* شەهید بوونی سەرکردەی ناوچەی تشادری فذ.

لە (٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٠٧ك) بەرامبەر بە (٢٢)ی نیسانی ساڵی (١٨٩٠ز) سەرکردەی موسڵمانەکان پێشەوا (رابح ی کوری زبێر) شەهید بوو، ئەوپیاوەی کەتوانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ناوچەی (تشارد) دابمەزرێنێت کە پایتەختەکەی شاری (دیکوا)یە.

* لە(٣)ی ڕەمەزانی (١٣)ی نیسانی ساڵی (٦٨٥ ز) مەروانی کوڕی حەکەم کوژرا لەتەمەنی ٦٣ ساڵیدا. دوای ئەوەی کە ویستی وڵاتی میسر بگرێت بۆ ئەو مەبەستە گەمارۆی میسری دا، دانیشتوانی میسر هاتنەدەرەوە بۆ بەرگری کردن و شەڕکردن لەگەڵ مەڕوان و هێزەکەیدا، ئەوەبوو شەڕ لەدەورو بەری میسر گەرم بوو لە ئەنجامدا مەروان توانی میسر داگیر بکات و ٨٠ پیاوی کوشت لەبەر ئەوەی دواکەوتبوون لە بەیعەت پێدانی، دوای ئەوەی کە بۆ ماوەی مانگێك لە میسر مایەوە پاشان کورەکەی خۆی کە ناوی (عبدالعزيز) بوو





کردی بە (والی) بەسەر (میسر) دا و هەریەك لە (بشر)ی کوری مەروان ی برای و (موسی) ی کوری نسیر)ی کردە وەزیر بۆی، پاشان مەروان بەرەو شام کەوتە ڕێ و لەوێ دایکی خالیدی مارە کرد کە خێزانی یەزیدی کوڕی معاویە بوو، مەبەستیشی لە مارە کردنەوەی ئەو ژنە سوك کردنی (خالید) بوو لە بەرچاوی خەڵکی. ئەوە بوو لە ۳ی ڕەمەزاندا لەوکاتەی کە خەوی لێ کەوتبوو خێزانەکەی (بالیفێك) سەرینێکی لەسەر دەمی داناو هەڵی نەگرت تا خنکاندی، دەسەڵاتەکەشی ماوەی نۆ مانگی خایاند.

* لە (۳)ی ڕەمەزانی مانگی (ایلولی) ساڵی (۱۱۸۹ ز) شاری (مریا)ی ئەندەنوس درووست کرایەوە بەتایبەت ئەو شوێنانەی کە روخا بوو وەکو دیواری دەوری شار و خانووەکانی ناو شار. بەهۆی ئەوەی (بەرشۆنیە ئیسپانیەکان) دەورەی شاری (مریای) ئەندەنوسیان دا ماوەی چەند مانگێك ی خایاند، ئیسپانیەکان مەنجەنیقیان بەکارهێنا بەڵام دانیشتوانی شارەکە کە بریتی بوون لە موسڵمانەکان بەرگریەکی باشیان کرد و چەندین شەهیدیان لەو پێناوەیا دا کە ژمارەیان ۱۵۹ شەهید بوو. دوای هەوڵێکی زۆری (بەرشۆنیە ئیسپانیەکان) بۆ گرتنی شارەکە بەڵام نەیان توانی بچنەناو شارەکەوە لەبەر بەرگری توندی موسڵمانەکان، ئەوەبوو بە ناچاری پەنایان بردە بەر ڕێکەتن و پاشەکشەیان کرد.

* لە (۳)ی ڕەمەزان ئیتالیا خۆی دا بەدەست هاوپەیمانەکانەوە لە جەنگی جیهانی دووەم دا، ئیتالیا دوای ئەوەی هاوپەیمانی لەگەڵ ئەڵمانیای نازی یەکان بەستا خۆی کردە ناو شەڕێکی هاتو نەهاتەوە، بۆیە دوای چەندین شکستی یەك لەدوای یەك بە ناچاری خۆی بەدەستی هێزەکانی بەریتانیاو ئەمریکاوە دا لە باکوری ئیتالیا.

* (الحکم)ی دووەم (المستنصر) وەفاتی کرد.





لە (٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣٦٦ ك) بەرامبەر بە (٢٥)ی نیسانی ساڵی (٩٧٧ز) (الحكم ی دووەم المستنصر بالله) دووەم دەسەڵات داری ئەمەویەکان لە ئەندەلوس وەفاتی کرد، لە ماوەی (٦) ساڵی دەسەڵاتیدا توانی گۆڕانکاری گەورە ئەنجام بدات و چەندین خزمەت و نوێکاری پێشکەش بە گەلەکەی و خەڵکی سەردەمی خۆی بکات، هەموو ئەم سەکەوتنانەشی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەو بە خیبرە و ئەزمونێکی زۆرەوە هاتە ناو کاری بەڕێوەبردنی دەسەڵاتەوە.

لە گرنگترین کارەکانی:

١- گرنگی دان بە شوێنە سەربازیەکان.

٢- هەوڵ دان بۆ لاوازکردنی دەسەڵاتی (فاتمیەکان).

٣- بەرپەرچ دانەوەی شۆڕشی (ئیدریسیەکان) کە شۆڕشێکیان بەرپاکردوو توانیان دەست بگرن بەسەر (تطوان) و (طنجة) و (اصلا) کە سێ شوێنی گرنگ بوون. ئەوە بوو کە خەلیفە توانی گورزێکی کاری گەریان لێ بدات و تەفروتونایان بکات.

٤- گرنگی دان بە زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری.

٥- گرنگی دانی زۆر بە زانایانی ئیسلامی و گێڕانەوەی ڕۆڵی ڕاستەقینە بۆیان و سود وەرگرتن لە خیبرەو ئەزمون و زانستەکانیان.

٦- دروست کردنی کتێبخانەیەکی گەورە لە ئەندەلوس کە بە گەورەترین کتێبخانە دادەنرا لە سەدەکانی ناوەڕاست دا، بە شێوەیەك کە لە خۆگری هەموو کتێبە ئەساسیەکان بوو بۆ ئەومەبەستە چەندین نێردراوی تایبەتی خۆی دەنارد بۆ ئەو شوێنانەی کە لەڕوی زانستیەوە پێشکەتوو بوون وەك (بەغداد) و (قسطنطنية) و هتد ...بۆ کڕینی کتێبە دەست نووسەکان تا سودیان لێ ببینن و لە کتێبخانەکەدا دای بنێن.





٧- کردنەوە و درووست کردنی چەندین خوێندنگا بۆ فێربوونی زانستە جۆراوجۆرەکان کە لە گرنگترینیان زانکۆی (قرطبە) بوو کە بە گەورەترین زانکۆکانی جیهان دادەنرا.



زانکۆی (قرطبة)

هەر کەسێك شەوی سێهەمی مانگی ڕەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە، مەلائیکەتێك لە ئاسمانەوە بانگی دەکات و دەڵێ: خوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردووت خۆش بوو...

(پێشەوا علی)

بۆ مرۆڤی ئازاو بەجەرگ، خۆشی و ناخۆشیەکانی ژیان وەکو دەستی ڕاست و چەپ وایە، کەڵك لە هەردووکیان وەردەگرێت. (وتە)

**دوعای رۆژی چوارەمی مانگی رەمەزان:**

**اللهم قوني فيه (في رمضان) على اقامة امرك، واذقني فيه حلاوة ذكرك، واوزعني فيه لاداء شكرك بكرمك، واحفظني فيه بحفظك وسترك يا ابصر الناظرين.**



**ی رەمەزان**

*** لەدەست دانی شاری (سرقسطة) لەسەر دەستی (الافرانج).**

**لە (٤)ی رەمەزانی سالی (٥١٢ك) شاری (سرقسطة) لە ولاتی (اندلس) لەدەست (الافرانج) چوو.**

*** فەتح کردنی شاری (بلجراد).**

**لە (٤)ی رەمەزانی سالی (٩٢٧ك) بەرامبەر بە (٨ی) ئابی (١٥٢١ز)**



سوڵتانی عوسمانی یەکان (القانونی) توانی بۆیەکەمجار فەتحی شاری (بلجراد) بکات کە بەکلیلی دەرگای ئەوروپای ناوەراست دادەنرا، لەگەڵ ئەوەشدا بلجراد خاوەنی قەڵایەکی بەهێز بوو کە عوسمانیەکان سێ جار گەمارۆی ئەوقەڵایەیان دا لە (١٤٤١ز ، ١٤٥٦ز ، ١٤٩٢ز) بەڵام نەیانتوانی سەکەوتووبن و بیگرن، ئەوە بوو دواجار لەسەر دەستی سوڵتانی قانونی ئەوشارە گیرا و فەتح کرا.

* بڕیار دانی شەر لەگەڵ ئەڵمانیا.

لە (٤)ی ڕەمەزانی (١٠٧٣ك) بەرامبەر (١٢)ی نیسانی ساڵی(١٦٦٣ز) دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری شەڕی لەگەڵ (ئەڵمانیا)دا لە دوای ٥٦ ساڵ ئاگربەست لە نێوانیاندا، هۆکاری شکاندنی ئاگر بەستەکەش ئەوەبوو ئەڵمانیا قەڵایەکی پتەوی لەسەر سنوری دەسەڵاتی عوسمانی یەکان درووست کرد.

* لە ٤ی ڕەمەزانی ١١ی مانگی نیسانی ساڵی (٦٢٣ ز) – پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) یەکەم (لیوا)ی بە سەرۆکایەتی پێشەوا (حمزەی کوڕی عبدالمطلب)(رضي الله عنه) پێك هێنا کە ٣٠ پیاوی کۆچەری لەخۆ گرتبوو، پاشان ناردنی بۆ سەر ڕێگەی کاروانێکی قورەیشیەکان بە سەرۆکایەتی ئەبوجەهل، بەڵام ئەوەبوو هیچ شەڕو ڕووبەروو بونەوەیەك لە نێوانیاندا روی نەدا.

* مامۆستا ملا محمدی سەلمان پاك کۆچی دوایی کرد.

لە (٤)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣١ك) بەرامبە بە (٢٠١٠/٨/١٤ز) مامۆستا ملا محمدی سەلمان پاك لە هەولێر کۆچی دوایی کرد، مامۆستا ناوی تەواوی محمدی صادقی کوڕی وەیسی کوڕی عبدالخالقی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئادەم ی باڵەکی یە، واتە (ابن ادم)ی ڕۆستایی. مامۆستا بە ملا محمدی سەلمان





پاك نسراو بوو، لە ساڵی (١٩٣١ز) و لە گوندی (پەسوە)ی سەربە شاری پیرانشەهری تێران لەدایك بووە. سەرەتای خوێندنی لای مامۆستا ملا صادقی باوکی دەست پێ کردووە لە گوندی



(دەربەندی ڕایەت)، پاشان لەپێناو خوێندنی زانستە شەرعیەکاندا زۆرێك لەم خوێندنگایانە گەڕاوە:

١- خوێندنگەی مامۆستا ملا نصرالله هەفشاری لە سەرسنوری ئێران

٢- خوێندنگەی مامۆستا ملا عبدالکریم ئەفەندی لە ڕەواندوز.

٣- لای مامۆستا ملا صالح ئەختەری لە ئاکۆیان.

٤- لای مامۆستا ملا شێخ صادق لە گوندی ماویلیان.

٥- لای مامۆستا ملا ابوبکر لە گوندی گەرموان.









٦- پاشان دەچێتە گوندی (کولیج) ی سەربە شاری پیرانشەهری ئێران.

پاشان گەڕاوەتەوە بۆ شاری هەولێرو لای جەنابی مامۆستای مەرحوم مامۆستا ملا صالحی گۆزەپانکەیی خوێندویەتی هەر لای ئەو مامۆستا بەڕێزە لە ساڵی (١٩٥٩ز) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. لە زۆرێك لە شارو گوندەکانی عێراق و کوردستان کاری مەلایەتی و وانەبێژی زانستە شەرعیەکانی کردووە. لەوانە:

١- مزگەوتی (الفضل) لە شاری بەغداد.

٢- شارۆچکەی (مدائن) سەلمان پاك.

٣- گوندی ناوەندە.

٤- مزگەوتی حاجی ابراهیم گەردی لە هەولێر.

مامۆستا لە ژیانیدا زیاتر لە (٥٠) قوتابی ئیجازەی مەلایەتیان لە خزمەتیدا وەرگرتووە کە هەندێك لەوانە عەرەب بوون. جگە لەوەش لە بواری (فەتوا)دان دا بەبلایەکی کەم وێنە بووە تەنانەت مامۆستا عبدالکریم ی مدرس لەبارەیەوە دەیفەرموو: ئەگەر لە هەر کێشەو باسێکی شەرعی قسەکرا رەئی رەئی مامۆستای سەلمان پاکە. مامۆستا لە ژیانیدا سێ ژنی هێناوە و ئێستا هەرسێکیان لە ژیاندا ماون، لە بەیانی رۆژی شەممە چوارەم رۆژی مانگی رەمەزان کاتژمێر (٧)ی بەیانی لە دوای ئەوەی پاشێوی کردبوو لەماڵی خۆی لەگەڕەکی سەیداوەی شاری هەولێر کۆچی دوایی کردو لە مەراسیمێکی شایستەدا لە گۆڕستانی شێخ احمد لە هەولێر بە خاك سپێردرا.




* لــە ٤ی ڕەمــەزانی ٣٠ی مــانگی تــشرینی یەکــەمی ســاڵی (١٠٢٣ ز) دانیشتوانی شاری (قرطبة) کۆبوونەوە بە مەبەستی هەڵبـژاردنی خەلیفـە بـۆ (قرطبة) دوای ئەوەی کە ڕزگاریان بوو لـە دەسـەڵاتی خۆسـەپێنەری بەرپـەڕی یەکان بە سەرۆکایەتی (قاسم ی کوڕی حەممود) دوای سێ هەفتە لە گفتوگـۆ و ڕاوێژکردن لە ئەنجامدا (عبدالرحمن ی کوڕی هیشام) ی ئەمەویان هەڵبژارد.

* لــە ٤ی ڕەمــەزانی (٢٣) مــانگی ئــابی ســاڵی (١٩٤٤ ز) خەلیفــە ی عوسمانیەکان (عبدالحمید)ی دووەم وەفاتی کرد، کە کۆتـا خەلیفـەی دەوڵـەتی عوسمانیەکان بوو. دوای ئەوەی ٧٦ ســاڵی تەمــەنی بـەڕێ کـرد و لـە پـاریس وەفاتی کرد و لە شاری مەدینە بە خاك سپێردرا.

هەرکەسێك شەوی چوارەمی مانگی ڕەمەزان بـە نوێـژی تـەراویح زیندو بکاتەوە،خوای گەورە پاداشتی ئەوکەسەی پێ دەبەخشێ کە تەورات و ئینجیل و زەبور و قورئانی خوێندۆتەوە...
(پێشەوا علی)



دوعای ڕۆژی پێنجەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم اجعلني فيه (في رمضان) من المستغفرين، واجعلني فيه من عبادك الصالحين القانتين، واجعلني فيه من اوليائك المقربين، برأفتك يا ارحم الراحمين.**



**ی ڕەمەزان**

*** لە دایك بوونی عبدالرحمن ی داخل (صقرقريش).**

لە (٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (١١٣ك) بەرامبەر بە (٩)ی تشرینی دووەمی ساڵی(٧٣١ز) (عبدالرحمن ی داخل) لە دیمشق لەدایك بوو کە دروست کەری دەوڵەتی ئەمەویەکان بوو لە ئەندەلس.

*** سلطان (المعزلدين الله) ی فاطمی دەچێتە ناو قاهیرە:**

لە (٥)ی ڕەمەزان دا دوای ئەوەی کە سلطان (المعزلدين الله) ی فاطمی توانی لە وڵاتی مەغرب جێی خۆی بکاتەوە، یەکێك لە سەرکردەکانی بەناوی (جوهر الصقلی) نارد بۆ (میصر) ئەویش توانی (میصر)ی بۆ فەتح بکات و هەر لەوێش دا هەڵسا بەدرووست کردنی شاری قاهیرە و زانکۆی ئەزهەر، پاشان لە (٥)ی ڕەمەزاندا (المعزلدين الله) چووە ناو شاری قاهیرەوە.

*** ابن حمدون دەبێتە بڕیار بەدەستی شاری قرتبە:**

لە (٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٣٩ك) (ابن حمدون) دەسەڵاتی شاری (قرطبة) قرتبە دەگرێتە دەست، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕێگرو کۆسپی زۆری هاتەڕێ بۆیە دەسەڵاتەکەی (١٤) ڕۆژیشی نەخایاند.







- موسڵمانەکان شاری ئەنتاکیە (انطاكية) لەژێر دەستی خاچ پەرستەکان دەر دەهێنن.



لە (٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٦٦ک) بەرامبەر بە (١٩)ئاداری ساڵی (١٢٦٨ز) موسڵمانەکان سەرکەوتوو بوون بەسەر خاچ پەرستەکان داو شاری ئەنتاکیە یان لێ سەندنەوە کە ماوەی ١٧٠ ساڵ بوو داگیریان کردبوو.





* لە(٥)ی مانگی رەمەزانی ساڵی(١٣٦٧ك) بەرامبەربە (١١)ی تەموزی ساڵی( ١٩٤٨ز) یەکەیەکی کۆماندۆی جولەکە بە سەرۆکایەتی (موشیەدیان) لە ئێوارەیەکی درەنگدا بە پاڵپشتی چەندین تانك و زرێ پۆش هەڵیان کوتایە سەر شاری (لەد) ی فەلەستین و بە ئاگرو ئاسن ئەو شارەیان خەڵتانی خوێن کردو زیاتر لە (٤٢٦) کەسی بێتاوانی ئەو شارەیان شەهید کرد، جگە لەوەش چەندین گەنجی ئەوشارەیان دەست گیر کردو پاشان داوایان لە خەڵکی ئەوشارە کرد کە لە ماوەی نیو کاتژمێر دا ئەو شارە بەجێ بهێڵن بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەگەڵ خۆیان ببەن تەنانەت نان و ئاویش، بۆیە ئەو کارە دڕندانەیەشیان بوە هۆی گیان لەدەست دانی چەندین ژن و منداڵ و پیری ئەوشارە کەلەبەر برسێتی و تینوێتی لە رێگەدا گیانیان لەدەست دا.

* شاری تەبریزی ئێران داگیر دەکرێت.

لە ٥ی رەمەزان دا سوپای عوسمانیەکان شاری (تەبریز)ی ئێرانی داگیر کرد لە جەنگی جیهانی یەکەم دا.

هەرکەسێك شەوی پێنجەمی مانگی رەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە،خوای گەورە پاداشتی کەسێکی پێ دەبەخشێ کە لە مزگەوتی (حەرام) کەعبە و مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) و مزگەوتی (اقصی) نوێژی کردبێت...

(پێشەوا علی)









**دوعای ڕۆژی شەشەمی مانگی ڕەمەزان:**

**اللهم لا تخذلني فيه (في رمضان) لتعرض معصيتك، ولاتضربني بسياط نقمتك، وزحزحني فيه من موجبات سخطك بمنك و اياديك يا منهي رغبة الراغبين.**



**ی ڕەمەزان**

*** کتێبی (تەورات) دادەبەزێت.**

**لە (٦)ی ڕەمەزاندا کتێبی (تەورات) (التوراه) دابەزی لەلایەن خوای گەورەوە بۆ سەر حەزرەتی موسی پێغەمبەر (ﷺ).**

*** فەتح کردنی ناوچەی (هند).**

**لە (٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٣ ك) بەرامبەر بە (١٤)ی ئاداری (٦٨٢ز) (محمدی کوری قاسم) سەرکەوت بەسەر سوپای (هند)دا لە نزیك ئاوی (الهند) و توانی فەتحی ئەو ناوچەیە بکات، ئەمەش لە کۆتایی سەردەمی (ولیدی کوری عبدالملك)دا.**

*** فەتح کردنی ناوچەی (عموریە).**

**لە (٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٢٣ك) بەرامبەر بە (٣١)ی تەموزی ساڵی (٨٣٨ز) خەلیفەی عەباسی یەکان (المعتصم بالله) ناوچەی (عموریە)ی فەتح کرد.**

*** سەرکەوتن بەسەر خاچ پەرستاندا.**







لە (٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٣٢ك) بەرامبەر بە (٢٧)ی ئاداری ساڵی (١١٣٨ز) موسڵمانان بۆ یەکەم جار سەرکەتن بەسەر خاچ پەرستەکاندا بە سەرۆکایەتی سەرکردەی لێهاتووی کوردی (عمادالدین زەنکی) لە خوارووی حەلەب .

* تۆپبارانی سماقوڵی و نازەنین:

لە (٦)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٨٧ز) هێزی ئاسمانی و تۆپخانەکانی بەعس بۆمبارانی ناوچەکانی سماقوڵی و نازەنینیان کرد.

* لە ٦ی ڕەمەزانی (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٠٠٥ز) زانای گەورە (حسن ی کوڕی هیثهم) گەیشتە میسر لەسەر داوای دەسەڵات دارو خەلیفە (الحاکم بامرالله الفاطمی) مەبەست لە بانگ کردنی ئەو زانا بەڕێزە لەلایەن خەلیفەوە بۆ ڕاوێژ پێکردنی بوو دەربارەی چۆنێتی سوودوەرگرتن لە ئاوی دەریای نیل و ئەو لافاوانەی








کە دەچنە ناو دەریای نیلەوە، بۆئەو مەبەستە مامۆستا (حسن) سەردانێکی (اسوان)ی کرد لە باکور بۆ لەنزیکەوە بینینی شوێنەکە تا بتوانێ باشترین شوێن و جێگە هەڵبژێرێ بۆ بەرگرتنی ئاوی (نیل) و ئەولافاوانەی کە هەڵدەستن، فیکرەیەکی تەرح کرد ئەوەبوو ئەوفیکرەیە بووە بەردی بناغەی دروست کردنی بەنداوی (العالی) کە لەم سەردەمەی ئێستادا دروست کرا.

هەرکەسێك شەوی شەشەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە، پاداشتی وەك ئەوکەسە وایە کەلە (بیت المعمور) نوێژی کردبێت و هەرچی دارو بەردیش هەیە داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکەن لای خوای گەورە...

(پێشەوا علی)

دوعای ڕۆژی حەوتەمی مانگی ڕەمەزان:

اللهم اعني فيه (في رمضان) على صيامه وقيامه، وجنبني فيه من هفواته وآثامه، وارزقني فيه ذكرك بدوامه، بتوفيقك يا هادي المضلين.



ی

ڕەمەزان

* ابراهیم ی کوڕی مەهدی وەفات دەکات:

لە (٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٢٤ك) (ابراهیم ی کوری مەهدی) وەفاتی کرد، کە دەکاتە مامی خەلیفە (مەئمون) شایانی باسە لەسەردەمی خەلیفەی عەباسیەکان (مەئمون) کرابە خەلیفە لە بەغداد.

* کردنەوەی مزگەوتی (الأزهر):

لە (٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣٦١ك) بەرامبەر بە ساڵی (٩٧١ز) بۆیەکەم جار نوێژ لەناو مزگەوتی (ئەزهەر) لە قاهیرە ئەنجام دراو لەو ڕۆژەوە مزگەوتی



(ئەزهەر) بوبە شوێنی بەندایەتی لەلایەك و زانكۆی فێربون لەلایەكی تر. دەكرێ بڵێین سەدەی نۆیەمی كۆچی سەردەمی زێرین بوو بۆ زانكۆی ئەزهەر كە بووبە ناودارترین زانكۆ لە ناو زانكۆ كانی قاهیرە دا، بەتایبەت ئەو كاتەی كە ناوبانگی (زانكۆی دایك و زانكۆی گەورەی ئیسلامی وەرگرت) زۆرێكیش لە گەورە زاناكان شەرعی وانە وتنەوەیان لەو زانكۆیە پێبەخشرا لەوانە: ابن خلدون.

* گرتنە دەستی دەسەڵات لە ئێراندا:

لە (٧)ی رەمەزانی ساڵی (٥٩٦ك) (علاء الدين محمد) ناسراو بە (خوارزم شاه) بوویە دەسەڵاتداری ئێران، ئەم پیاوە لەگەڵ ئەوەی كەسێكی ئازاو باوەڕ پتەو بوو بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، بەڵام كارەسات و نەهامەتیەكی گەورەی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا هێنا، كاتێك كە خۆی خستە ناو شەڕو كێشمەكێش لەگەڵ مەغۆلەكان بەبێ ئەوەی ئامادەباشی پێش وەختە بۆ ئەو كارە بكات، سەرئەنجام كاری بۆ دوژمنان ئاسانكرد تا بێنە ناو خاكی موسڵمانان و دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن بەسەر موسڵماناندا.

* هەوڵی پێكهێنانی دەزگای زەكات دەدرێت:

لە(٧)ی رەمەزاندا یەكەم هەوڵی پێكهێنانی مەشروعێكی ئیسلامی درا لە ژێر ناونیشانی (دەزگای زەكاتی ئیسلامی ئەفریقی)، ئەم هەوڵەش لە پایتەختی وڵاتی سنغالیە(دكار) درا.

* پێكهێنانی دادگایەكی شەرعی:

لە (٧)ی رەمەزان دا وڵاتی (زامبیا) پێكهێنانی یەكەم دادگای تێهەڵچونەوە (استئنافیە)ی شەرعی بەخۆوەبینی لە پێناو لێكۆڵینەوەو تێڕامانی ئەو كێشەو





داوایانەی کە لەناو موسڵمانانی ئەو وڵاتەدا دروست دەبێت، سەرۆکی ئەو وڵاتە لە رون کردنەوەیەکدا وتی ئەم کارەی ئەنجامان داوە هاوتەریبە لەگەڵ بەندی ١٣٧ لە یاسای ساڵی ١٩٩٧ی وڵات، رونیشی کردەوە کە ئەم بڕیارە وەڵامدانەوەی داواکاری موسڵمانانی وڵاتەکەمان بوو.

* (سیِّری سەقەطی) وەفات دەکات:

لە ٧ی رەمەزان و دوای بانگی بەیانی شێخ (سیِّری سەقەطی) کۆچی دوایی کرد، کە یەکێك بوو لە گەورەی سۆفیەت و عابدو زاهیدێکی کەم وێنەو خاوەن کەرامات بوو، لەو نەخۆشیەی کە تێیدا کۆچی دوایی کرد قەسیدەیەکی دانا کە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:

| | |
|---|---|
| القلب محترقـاً والـدمعُ مُستبقُ | والكربُ مجتمعٌ والصبر مفترقُ |
| كيف القرار على من لا قرار له | مما جناه الهوى والشوقُ والقلقُ |
| يـاربُ أن كـان شئٌ لي به فرج | فـأمتن عليَّ به مادام به رمقُ |

واتە : دڵم دەسوتێ و فرمێسك لە چاوانم دەبارێ، دڵم تەنگەو خەفەت دەوری داوم و خەریکە ئارامم نامێنێ، چۆن قەرار دەگرم لە کاتێکدا قەرار وایە دونیا شوێنی قەرار گرتن نەبێ، نارەحەتم لەو گوناهانەی بەهۆی حەزو ئارەزو و غەفڵەتەوە توشم بوو، دەسا خوایەگیان تۆش من لە گوناهەکانم پاك بکەرەوە و رزگارم بکەپێش ئەوەی لە دونیا دەربچم.

* کردنەوەی خوێندنگای ( الجوهريه)

لە ٧ی رەمەزانی (٢٠) مانگی کانونی یەکەمی ساڵی (١٢٨١ ز) لە دیمەشق خوێندنگای (الجوهريه) کرایەوە کە شێخ (نجم الدين محمدی کوڕی عباسی کوڕی









ابی المکارم ی تمیمی جەوهەری) وەقفی کردو تێیدا قازی حەنەفی (شێخ حسام الدین الرازی) وانەی تێدا دەوتەوە.

* وەزیری خۆی دەکوژێت:

لە ٧ی ڕەمەزانی (٢٢) مانگی ئەیلولی ساڵی (١٥١٧ ز) سوڵتانی عوسمانی (سلیم)ی یەکەم، وەزیری گەورەی خۆی (یونس پاشا)ی لە سێدارە دا. لەسەر ئەوەی کە سەرزەنشتی سوڵتانی کردبو بەوەی کە دەستی بەسەر میسردا گرتووەو ئێستا هیچ حیسابێکی بۆ ناکات لە کاتێکدا نیوەی سوپاکەی لەسەر دانا، وەهەروەها (خیرالدین ئاغای انکشاری) دەست نیشان کردووە بۆ ڕاپەڕاندنی هەندێك کار کە یەکێکە لە ئومەراکانی مەمالیك و ئەوان بوون خیانەتیان لەگەڵ عوسمانیەکان کرد، ئەم هەڵوێستەی (یونس پاشا) سوڵتانی زۆر تووڕەکردو هەر زوو بڕیاری کوشتنی دەرکرد.


پەتی سێدارە






* (٧٠٠٠) بەندکراوی موسڵمانەکان ئازاد دەکرێن:

لە ٧ی ڕەمەزان ی ١٧ی مانگی ئابی ساڵی (١٥٥٧ ز) سەرکردەی دەریایی عوسمانیەکان (طرغد بگ) توانی دەست بگرێت بەسەر جەزیرەی (کورێکا) و شاری (کاتانیا)ی سەقلیە دا، ئەوە بوو دوای شکاندن و وێران کردنی بەربەستەکان زیاتر لە (٧٠٠٠) بەندکراوی موسڵمانی تێدا ئازاد کرد.

هەر کەسێك شەوی حەوتەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە، پاداشتی لای خوای گەورە وەکو ئەوکەسە وایە کە بە (موسی پێغەمبەر) (عليه السلام) گەیشتووەو یارمەتی داوە لە دژی فیرعەون... (پێشەوا علی)



**دوعای ڕۆژی هەشتەمی مانگی ڕەمەزان:**

**اللهم ارزقني فيه (في رمضان) رحمة الايتام واطعام الطعام وافشاء السلام وصحبة الكرام بطولك يا ملجأ الاملين.**



**ی ڕەمەزان**

*** غەزای تەبوك:**

لە (٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٨)ی کانونی یەکەمی ساڵی (٦٣٠ز) غەزای تەبوك (العسرە) ڕوویدا و پێغەمبەر (ﷺ) بە سەرکەوتویی گەڕایەوە ناو شاری مەدینە.

*** عەبباسیەکان شکست دێنن:**

لە (٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٩ك) گورزێکی کاریگەرو کەمەر شکێن بەر گەورە سەرکردەی عەباسییەکان (زهیری کوری مسیب) کەوت، عەباسیەکان لە زۆرێك لە شەڕەکاندا سەرکەوتوو دەبوون، بەڵام لە (٨)ی ڕەمەزان دا توشی شکستێکی چاوەڕوان نەکراو بوون. لەوکاتەی (زهێر) بەخۆی و دە هەزار سوارو پیادەوە ڕوی کردە شاری کوفە، کاتێك دانیشتوانی شاری کوفە دەنگو باسەکەیان بیست زۆر ترسان و لەبەر کەمی ژمارەی چەکدارەکانیان نەیان توانی بچنەدەرەوە بۆ ڕووبەرو بونەوەیان، بۆیە بڕیاریاندا دابنیشن و ڕووبەڕویان نەبنەوە تا دێنەناوشار، کاتێك گەیشتنە قەراغەکانی دەوری شار بە تایبەت شوێنێك کە پێی دەوترا (صعبا) لەوێ لایان دا، پاشان توشی ڕووبەرو بونەوەیەکی توند بوون و گورزێکی کاریگەریان لێدرا.

*** گەورەترین ڕێوڕەسمی ژن گواستنەوە لە مێژوودا:**







لە (٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢١٠ك) شاری (بەغدا) گەورەترین مەراسیم و ئاهەنگی ژن گواستنەوەی بە خۆوە بینی کە لەمێژوودا هاوشێوەی ئەنجام نەدرابوو!! ئەویش، ئاهەنگی گواستنەوەی (بورانی کچی حسن ی کوری سەهل) بوو لەلایەن خەلیفەی عەباسی یەکان (مەئمون) کە بە تاکە ئاهەنگی بێوێنەی مێژویی دادنرێت بە پێی قسەی پێشەوا (طبری) و (ابن الجوزی) ڕەزای خوایان لێبێ.

* لە دایك بوونی خەلیفە (المقتدربالله)

لە (٨)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٢٨٢ك) خەلیفە (مقتدربالله جعفری کوری معتضد) لەدایك بوو، لە تەمەنی ١٣ ساڵی بویە خەلیفە.

* سۆڤیەت پارەی ئیسپانیا دەدزێت:

لە (٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٥٥ك) بەرامبەریە (١٩٣٦/١١/٢٢ز) لە گەرمەی شەڕی ناوخۆی ئیسپانیادا سۆڤیەت توانی کۆماریەکان بخەڵەتێنێ و (٧٢٥) تەن ئاڵتون لە (١٠) هەزار صندوقی قەبارە (٣٠×٤٨×١٨)سم بەرێت کە بە (٢٠) سەیارە بەسێ شەو لەکاتژمێر (٧)ی ئێوارە تا بەیانی لە ئەشکەوتەکانی (قرتاجیە) وە گەیەنرایە کەنارەکانی ئیسپانیا و لەوێشەوە بە پاپۆڕ ڕەوانەی سۆڤێەت کران. کاتێك کە ئیسپانیا داوای کردەوە سۆڤیەت وتی ئێمە بایی (٦٥٠) ملیۆن دولار فڕۆکەو چەکمان داوە بە کۆماریەکان و ئێستاش ئێوە (٥٠) ملیۆن دۆلار قەرزاری ئێمەن.

* پێشەوا جعفری صادق لە دایك بوو.

لە (٨)ی مانگی ڕەمەزانی (٧٠)ز پێشەوا جعفری صادق لەدایك بوو کە یەکێکە لە پێشەوا موجتەهیدەکانی فقهی ئیسلامی.





● دەست بەسەر خوراساندا دەگیرێت:

لە (٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٣١ك) بەرامبەر بە (٢٣)ی ئایاری (١٠٤٠ز) سوڵتانی سەلجوقی (طغرل بگ) سەرکەوت بەسەر سوپای دەوڵەتی (غەزنەویە) دا لە شەڕی (دندانكان) و توانی دەست بەسەر خوراساندا بگرێت و غەزنەویەکان ناچار بکات تا دان بنێن بە دەوڵەتی سەلجوقی دا وەکو گەورەترین و بەهێزترین دەوڵەت لە ناوچەکەدا.

● سەرەتای دەستپێکردنی دەسەڵاتی سەلجوقی:

لە(٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٥٥ك) بەرامبەر بە (٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٠٣٦ز) سەرەتای دەست پێکردنی دەسەڵاتی سوڵتانی سەلجوقی (الب ارسلان) بوو، لەدوای مردنی مامی سوڵتان (طغرل بگ) کە بە بناغە دارێژەری راستەقینەی دەوڵەتی سەلجوقی دادەنرا، (الب ارسلان)یش بەگەورە پیاوی مێژو ناو دەبرێت و خاوەنی گەورەترین سەرکەوتن بوو بەسەر ڕۆمەکاندا لە شەڕی (ملاذكرد)دا.

● دەریای دیجلە مەترسی بۆسەر هاووڵاتیان درووست دەکات:






لە (٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٦٩ك) ئاوی دیجلە بە شێوەیەکی مەترسی دار زیادی کرد و پاشان لەشەوی هەینی دا بارانێکی بە خوڕ دایکرد و چەندین خانوو بە هۆی یەوە ڕوخان و چەندین کەسیش بونە قوربانی، پاشان خەلکی ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشت و لە دەشتایەکاندا خێمەیان هەڵدا، خەلیفە (قیماز) کە دەسەڵات داری ئەوکاتەی ئەو ناوچەیە بوو بەتەنها خۆی ئیشی دەکرد و فەرمانیشی بە دارو دەستەکەی دا کە پارێزگاری لە ماڵ و سامانی خەلکی بکەن.

* بۆ یەکەم جار موسڵمانەکان نەیان توانی لە مانگی ڕەمەزاندابە ڕۆژوبن:

لە ٨ی ڕەمەزانی ساڵی (١٥٠٢ ز) موسڵمانانی (پرتغال) بۆ یەکەم جار نەیانتوانی بەڕۆژوبن، بەهۆی ئەو فشارە زۆرەی کە کرایە سەریان لەلایەن کەنیسەی کاسۆلیکیەوە، ئەوە بوو کەنیسە بڕیاری دا کە دەبێ موسڵمانەکان ناچار بکرێن تا لە ئیسلام پەشیمان ببنەوە، موسڵمانەکان لەترسی دین و گیانی خۆیان پەنایان بردە بەر شاخ و دەشتایی یەکان و هەندێکیشیان بە نهێنی کۆچیان کرد بۆ باشوری ئەفریقیا، لەبەرئەوە ڕۆژویان بۆ نەگیرا.

هەرکەسێك شەوی هەشتەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە،پاداشتی وەکو پاداشتی بەشدار بوانی (غەزای بەدرە)...

(پێشەوا علی)

**دوعای ڕۆژی نۆیەمی مانگی ڕەمەزان:**

**اللهم اجعل لي فيه (في رمضان) نصيبا من رحمتك الواسعة، واهدني فيه لبراهينك الساطعة، وخذ بناصيتي الى مرضاتك الجامعة بمحبتك يا امل المشتاقين.**




*** دەست پێکردنی فتوحاتی ئیسلامی:**

**لە (٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٩٣ ك) بەرامبەر بە (١٨)ی حوزەیرانی ساڵی(٧١٢ز) سەرکردەی موسڵمان (موسی ی کوری نصیر) هەوڵەکانی دەست پێکردەوە بۆ تەواو کردنی فەتح کردنی ئەندلوس، ئەوەبوو هەریەك لە (ئیشبیلیە) و (طلیطلة)ی فەتح کرد.**

*** شەڕی (بلاط الشهداء) :**

**لە (٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (١١٤ك) بەرامبەریە تشرینی یەکەمی ساڵی (٧٣٢ز) ڕوداوی (بلاط الشهداء) ڕوی دا،لە نێوان (شارل مارتل)ی سەرۆکی (فرنجە) و (عبدالرحمن غافقی)، لەو ڕوداوەدا عەرەبەکان شکستیان خوارد و (غافیقی)ش کوژرا، لای فەرەنجەکان ئەو ڕوداوە بە ڕوداوی (تور) یان (بواتییە) بەناوبانگە.**

*** فەتح کردنی دورگەی سەقیلە:**

**لە (٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢١٢ك) بەرامبەریە (١)ی کانونی یەکەمی ساڵی (٨٢٧ز) موسڵمانەکان لەپێناو بڵاوکردنەوەی پەیامی خوا دابەزینە قەراغی**




دەریاکانی دورگەی سەقیلە(صقیلە)، دەستیان گرت بەسەریداو فەتح کردنەکەش لەسەر دەستی (زیاد ی کوری ئەغلەب ) بوو.

* کۆتایی هاتنی بزوتنەوەی (بابك):

لە(٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٢٢ك) بەرامبەر بە ساڵی(٨٣٧ز) خەلیفە (معتصم)ی عەباسیەکان داوای لە سەرکردە (حیدر ی کوری کاوس) ناسراو بە (ئەفشین) کرد تا بچێتە ناو شاری (البذ) کە بارەگای (بابك ی خرمی) لێ بوو، حیدەر بە فەرمانی خەلیفە چوەناو شارەکە، بەڵام (بابك) و دارو دەستەکەی ڕایان کرد، پاشان حیدەر توانی دەست گیریان بکات و بیان بات بۆ سامەڕا، لەوێ بابك و هەندێ لە شوێنکەوتوانی لەلایەن حەیدەرەوە کوژران، بەم شێوەیە کۆتایی بە بزوتنەوەی (بابك) هات کە ماوەی ٢٠ ساڵ بوو بوونە ڕێگر لەبەردەم موسڵمانان دا.

* شەڕی زەلاقە:

لە (٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٧٩ك) بەرامبەر بە (١٧)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٠٨٦ز)- (یوسفی کوری تاشفین) سەرۆکی سوپای (مرابتین) (المرابطین) توانی سەربکەوێ بەسەر فەرەنجیەکان دا بە سەرۆکایەتی (فونسی) شەشەم لە شەڕی (زەللاقە)دا. لەو ڕوویەڕوو بوونەوەدا (فونس) بە خۆی و تەنها (٩)کەسی سوپاکەیەوە رزگاری بوو.

* ئەنفال بە جینۆساید دەناسرێت:





لە (٩) ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٩ك) بەرامبەریە (٢٠٠٨/٩/١٠ز) دادگای تاوانەکانی عێراق بە فەرمی بڕیاری دا پرۆسەی (بەناو ئەنفال) بە جینۆساید بناسێنێ.

* قەزای چەمچەماڵ خرایە سەر پارێزگای سلێمانی:

لە (١٢)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٩٠ك) بەرامبەر بە (١٩٧٠/١١/٦ز) حکومەتی عێراق بە فەرمانی مەهی و بە نوسراوی ژمارە(٢٥٨)بڕیاری دا




قەزای چەمچەماڵ لەسەر پارێزگای کەرکوك دابڕێ و بیخاتە سەر پارێزگای سلێمانی، مەبەستیش لەم کارەی ڕژێم کەمکردنەوەی ژمارەی کورد بوو لەو پارێزگایە.

* یەکەم قافڵەی موجاهدینی حیجاز دەگاتە میسر:

لە (٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٢١٣ك) بەرامبەر (١٨)ی شوباتی ساڵی (١٨٩٩ز) یەکەم قافڵەی موجاهدینی حیجاز کە پێك هاتبوو لە چەند لیوایەك






**گەیشتە میصر بۆ بەشداری کردنی جیهاد شان بەشانی برا میصریەکانیان لە دژی خاچ پەرستە فەرەنسیەکان.**

*** (بولغاریا) بڕیاری جیابوونەوە دەدات:**

**لە (٩)ی ڕەمەزانی مانگی نیسانی ساڵی (١٩٠٩ ز) – بلغاریا بڕیاری جیابونەوە و سەربەخۆیی خۆی لە دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند و بڕیاری دا کار بەدەستوری مەلەکی بکات، دەوڵەتی عوسمانی ڕەزامەندی نیشاندا لەبەرامبەر (٥ ملیۆن) لیرەی زێڕ دا کە پێی بدرێ لەلایەن بولغاریاوە، شایانی باسە بولغاریا مساحەی خاکەکەی تەنها ٩٦ هەزار کیلۆمەتر دووجابوو و ژمارەی دانیشتوانەکەی ٤ ملیۆن کەس بوو.**

ئەوکەسەی شەوی نۆهەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە،وەکو ئەوکەسە وایە کە خواپەرستی کردووە لەسەر ئەو شێوازەی کە (داود پێغەمبەر) (ﷺ) کردوویەتی... (پێشەوا علی)



**دوعای ڕۆژی دەیەمی مانگی ڕەمەزان:**

**اللهم اجعلني فيه (في رمضان) من المتوكلين عليك، واجعلني فيه من الفائزين لديك، واجعلني فيه من المقربين اليك باحسانك يا غاية الطالبين.**



# ١٠ ی ڕەمەزان

*** دیمەشق داگیر دەکرێت:**

**لە (١٠)ی ڕەمەزانی (٢٢)ی نیسانی ساڵی (٧٥٠ ز) – (عبداللە ی کوڕی علی) هات گەمارۆی دیمەشقی دا، لەمەر پێنج دەرگاکەیەوە ئامادەباشی**



**تەواویان کردبوو تابچنە ناو شارەکەوە، سەرەتاش بەروخاندنی دیواری دەوری شارەکە دەستیان پێکرد و بۆ ئەومەبەستە خەڵکێکی زۆری ئەو شارەیان کوشت، لەناو شارەکەشدا دوبەرەکی لەنێوان عەباسیەکان و ئەمەویەکان دروست**







بوو و شەڕێکی ناوخۆیی سەری هەڵدا، ئەوە بوە کارەساتێک تا زۆر بەئاسانی دیمەشق بدەن بەدەستەوە. ئەوەبوو لە ڕۆژی چوارشەممەدا هێزەکانی (عبداللە کوڕی علی) توانیان تەواوی دیمەشق داگیر بکەن.

* خاتوو خەدیجە وەفاتی کرد:

لە (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣ ق.ك)ی بەرامبەر بە ساڵی(٦٢٠ز) حەزرەتی خاتوو خەدیجەی دایکی ئیمانداران ی خێزانی یەکەمی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) وەفاتی کرد.

* پلان بۆ گرتنی شاری مەککە دادەنرێت:

لە (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (١)ی کانونی دووەمی ساڵی (٦٣٠ز) پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکان دەستیان کرد بە جوڵەو پلان دانان



بۆ گرتنی شاری مەککە.

* لە (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٢ك) بەرامبەر بە (٢١)ی نیسانی ساڵی (٧٥٠ز) خەلیفەی ئەمەویەکان وەلیدی کوڕی معاویەی کوشت.

* لە (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٨٥ك) بەرامبەر بە (١٣)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٠٩٢ز) - (نهاوەند نظام الملك) باوکی (حسن ی علی کوری اسحاق) کوژرا کە وەزیری دەستە ڕاستی سوڵتان (ألب ارسلان ) بوو پاشان بۆ ماوەی ٣٠ساڵ وەزیری کوری (ألب اسلان) (ملشکاه) بوو، نضام الملك کەسێکی زاناو بەخشندەو نەرم و نیان بوو، ناسراوبوو بە گرنگی دان بە درووستکردنی قوتابخانە و خوێندنگە لە وڵات دا.

* لە (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٤٨ك) بەرامبەربە ساڵی (١٢٥٠ز) خاتو (شجرة الدر) خێزانی (مەلیك صالح) لە شەڕی مەنصورە (المنصورە) توانی بەسەر (لویس)ی نۆیەم دا سەربکەوێت و لویس بەدیل بگرێت و ژمارەیەکی زۆریش لە سەربازەکانی بکوژێت.

* جەنگی جیهانی یەکەم:

لە ١٠ی مانگی ڕەمەزان ی ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی بەرامبەر بە ١ی مانگی (تاب)ی ساڵی ١٩١٤ی زاینی جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد، بە شێوەیەك کە



جەنگی جیهانی یەکەم






چەندین ملیۆن مرۆڤی تێدا کوژرا.

* لە (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٩٣ک) بەرامبەر (٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٣ز) هێزەکانی (میصر) کە پێیان دەوترا (باشترین سەربازی سەرزەوی) سەرکەوتن بەسەر جولەکەکاندا لە شەڕی (العبور)دا لە هەمان کاتدا هێزەکانی بەرەی سوریاش توانیان بە هەمان شێوەی بەرەی میصر سەربکەون بەسەر جولەکەکاندا لە هەمان شەڕدا، ئەم سەرکەتنە لەدوای ئەو زنجیرە شکستانە هات کە عەرەبەکان لەبەرامبەر جولەکەکاندا خواردیان.

* شارەکانی (السند) ڕزگار دەکرێت:

لە ١٠ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٩٣)ی کۆچی سوپای موسڵمانان بە سەرۆکایەتی (محمد ی کوڕی قاسم الثقفي) دوای شەڕێکی کەم خایەن توانیان بەسەر سوپای (السند)دا سەربکەون و سەرۆکەکەشیان کە ناوی (داهر) بوو بیکوژن، دوای ئەم سەرکەوتنەیان



بەتەواوی دەستیان گرت بەسەر شارەکانی (السند) دا.




*** ڕزگار کردنی شاری دیمەشق:**

**لـە ١٠ی مـانگی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٣٩٣ك) بەرامبەربـە (٦)ی تـشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٣ز) سـەرەتای دەسـت پێکردنـی شـەڕی نێـوان سـوپای عەرەبەکان و جولەکەکان بوو، کە بووە هۆی تێکچونی ڕێگای (بارلیف) پاشان هێزەکانی سوپای عێراق گەیشتنە (سوریا) و شاری (دیمەشق) یان لـە دەسـتی چەپەڵی جولەکە پاراست و ڕزگاریان کرد.**

ئەوکەسەی شەوی دەیەمی مانگی ڕەمەزان بـەکردنی نوێـژی تـەراویح زیندو دەکاتەوە، خوای گـەورە سـەلامەتی دەکـات و دەپـارێزێ لـە دونیـاو دوارۆژدا، جگەلـەوەش لـە ڕۆژی قیامـەت دا دەتـوانێ شەفاعەت و تکا بۆ حەفتا کەس بکات... (پێشەوا علی)



دوعای ڕۆژی پانزەیەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم حبب اليَّ فيه (في رمضان) الاحسان، وكره فيه الفسوق و العصيان وحرم علي فيه السخط والنيران بعونك يا غياث المستغيثين.**



**ی ڕەمەزان**

* نەخۆشی تاعون بڵاو دەبێتەوە:

لە (١١)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٤٨ز) نەخۆشیەکی کوشندە لەناو دانیشتوانی میسر و ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بڵاو بوویەوە ئەمەش بەهۆی هاتنی کەشتیەکی نەفەرهەڵگر لە ئەوروپاوە بۆ میسر، ئەو (تاعون) نەخۆشیە پێش ئەوەی بگاتە میسر ( ٢/١)ی دانیشتوانی ئینگلتەرای لەناوبرد، ٤/١ ی دانیشتوانی وڵاتی (صین) و ٣/١ ی ئەوروپای لەناو برد، لە میسرو شام و عێراق وفارس و حیجاز سەدان هەزار کەسی لەناو برد، ترس و دڵەڕاوکێی خستە ناو دڵی دانیشتوانی سەرزەویەوە، بە تایبەت لە میسر نۆسەد هەزار کەسی کوشت بۆ جاری دووەم ئەو نەخۆشیە روی کردە شاری قاهیرە و سەدان ژن و منداڵی کوشت، نەخۆشیەکە ئەوەندە بەهێز بوو توشی هەرکەس ببوایە یەکسەر دەیکوشت، جگەلەوەش زۆرێك لە کاربەدەستانی دەوڵەتیش بەهۆیەوە مردن.

* لە (١١)ی ڕەمەزانی ساڵی (٩٥ك) بەرامبەریە ساڵی (٧١٤ز) (سەعدی کوری جبیر) شەهید بوو بەدەستی (حەجاجی کوری یوسفی سەقەفی).




* لـە (١١)ی رەمـەزانی سـالّی (١٢٩ك) بەرامبـەر (٢٥)ی ئایـاری سـالّی (٧٤٧ز) بانگەشەی بنی عباس ئاشکرا کراو سەری هەلّدا لـە خوراسـان بـە سەرۆکایەتی (ابی مسلم ی خوراسانی).

* لە (١١) رەمەزانی سالّی (٦٢٤ك) بەرامبەر (٢٥)ی ئابی سالّی (١٢٢٧ز) (تەموجین ی کوری یەسوکای بەهادر) ی ناسراو بە (جنگیزخان) کۆچی دوایـی کـرد، ئـاوبراو دروسـتکەری ئیمپراتۆریـەتی (مـەغۆل) بـوو یـەکێك بـوو لـە شەرکەرەکان کە مێژوی لەکەدار کردو مێژو لەدەستی بێزار بوو چەندین تاوانی گەورەی دژبە مرۆڤایەتی ئـەنجام دا کـە زمـان نـاتوانێ باسی بکـات، ئەمـە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە کەسـێکی بـەتوانا بـوو لـەبواری رەوان بێـژی و بڕیاردان و رێزی زۆری لە زانایان دەگـرت و کەسـی شـارەزاو خـاوەن خیـبرەی دەکردە راوێژکاری خۆی.



* لە (١١)ی رەمـەزانی سـالّی (٦٥٥ك) بەرامبـەر (٢١)ی ئـەیلولی سـالّی (١٢٥٧ز) سـەرکردەی مەغۆلەکان (هۆلاکۆ) نامەیەکی ئاراستەی خەلیفـەی عەباسـیەکان (معتـصم باللـە) کـردو تێیـدا داوای کردبوو کە خەلیفە خۆی تەسلیم بکات و بەملکەچـی و بە ئاشکرا و لەبەرچاوی خەلکا ملکەچیی خۆی لـە بەرامبەر هۆلاکۆدا بنوێنێ.

* لە (١١)ی رەمـەزانی سالّی (٩٨٦ك) بەرامبـەر (١١)ی تـشرینی دووەمـی سـالّی (١٥٧٨ز) عوسمانیەکان توانیان سەربکەون بەسەر سـەفەویەکان



**دا لە شەری (شماهی) لە (قەفقاس)، سەفەویەکان گورزێکی کاری گەریان بەرکەوت کە نزیکەی ١٥ هەزار کەسیان لێ کوژرا.**

*** شەڕی (البویب):**

**لە ١١ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤)ی کۆچی شەڕی (البویب)[1] بەرپابوو لە نێوان سوپای موسڵمانەکان بە سەرۆکایەتی (المثنی ی کوڕی حارثة الشیبانی) و سوپای فارسەکان بە سەرۆکایەتی (مهران) کە تێیدا سوپای موسڵمانەکان سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا، ئەمەش بووە ڕێگە خۆشکردنێك لەبەردەم موسڵمانەکان دا تا بتوانن (قادسیە)ش بگرن و ڕزگاری بکەن.**

ئەو کەسەی شەوی پانزەهەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە،لە دونیادا بە تێرئاوی دەمرێ و بە تێرئاوی زیندو دەبێتەوە و لەسەر پردی سیراتیش وەك تیشك دەپەڕێتەوە...

(پێشەوا علی)

**هەرگیز بیر لە ڕابردوی خۆم ناکەمەوە، مەگەر بمەوێ ئەنجامێکی لێوەربگرم.**

**(وتە)**

---

[1] **ناوی ڕوبارێکی بچوکە لە نزیك شاری کوفە.**










دوعای ڕۆژی دوانزەیەمی مانگی ڕەمەزان:

اللهم زيني فيه (في رمضان) بالستر والعفاف، واسترني فيه بلباس القنوع والكفاف، واحملني فيه على العدل والانصاف، وآمني فيه من كل ما اخاف بعصمتك يا عصمة الخائفين.



ی

ڕەمەزان

* شاری (دمیاط) داگیر دەکرێت:

لە (١٢) ڕەمەزان دا هێزەکانی ڕۆم بەسەرکردایەتی (تیودور)ی چوارەم و لەسەردەمی خەلافەتی (المتوکل علی الله) هێرشێکی گەورەی کردە سەر شاری (دمیاط)ی میسر کەلەوکاتەدا میسر ولایەتێکی ئیسلامی بوو



بەدەستوری خەلافەت، ئەوهێزە تێکدەرە کە هاتنە ناو شاری (دمیات)، سەرەتا




دەستیان کرد بە سوتاندنی مزگـەوت و ماڵـەکان و بـڵاو کردنـەوەی فەسـاد و خراپەکاری جگەلەوەش قاچی پیاوەکانیان دەبـڕی و سـوکایەتیان بـە ئافرەتـان دەکرد، ئەم کارەی ڕۆمەکان هەڕەشەیەکی ترسـناك بـوو بـۆ سـەر خەلافـەتی ئیسلامی، موسڵمانەکانیش لە هەوڵی خۆ ڕێکخستنەوەیاندا بوون بۆ بەرپـەرچ دانەوەی ئەو ستەم کاریە، ئەوە بوو فیعلەن هەوڵی ڕۆمەکان پێچەوانە بووەوە و ئەو کارەیان بووە سەرەتای دروست بونی دەوڵەتی (الطولونیة) کە نوێنەرەکەیان (ابن طولون) بوو.

* خاوەنی (الفیه) وەفات دەکات:

لە (١٢)ی ڕەمەزان مامۆستا (ابو عبدالله الجیانی) ناسـراو بـە (ابـن مالـك) خاوەنی (الفیه) لە دیمەشق کۆچی دوایی کردو لە (سفحی شاخی قاسـیون) لـە سوریا بە خاك سپێردرا، (ابن مالك) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە (جەییان) لەدایك بووە و یەکێك بووە لە زانا باشەکان لە گشت زانستەکاندا بە تایبەت لە بواری (نەحو) دا بەهۆی (الفیه)وە ناوبانگی دەرکردو تەواو ناسرا. (الفیه) پێکهاتووە لە (١٠٠٠) شیعری (نەحوی) و چەندین جار لەهەموو دنیا چاپ کراوەتـەوە و تا ئێستاش لە حوجرەو خوێندنگاو کۆلێژەکاندا بەوانە دەوترێتەوە، شایانی باسە (ابن مالك) هاوڕێیەکی خۆشەویستی (ابن خەلەکان) بووە.

* پێشەوا بەلقینی لە دایك بوو:

لە ١٢ ڕەمەزاندا پێشەوا (البلقینی) شێخ الاسلام سراج الدین ابو حفص عمری کوڕی رسلان ی کوڕی نصیری کوڕی صالح الکنانی ) چاوی بـەدونیا هـەڵهێناو لەدایك بوو، پێشەوا (البلقینی) یەکێك بوو لە مجتهدەکانی سەردەمی خـۆی و زانایەکی کەم وێنەی سەدەی هەشتەم بـوو، ئـەم زانایـە زانـستی (فقـە)ی لـە







هەرسیێ زانای گەورە (ابن عدلان ) و (التقی) و (السبکی) وەرگرتووە و زانستی (نحو)ی لە (ابن حیان)وەرگرتووە و پاشان شارەزایی تەواوی لە زانستی(فقـه) و (حدیث) و (اصول) پەیدا کردووە و گەیشتۆتە پلەی (ئیجتهاد) کردن و چەندین قسەو بۆچوونی جیاوازی هەیـە لـە مەزهـەبی پێـشەوا شـافعی دا، تەنانـەت هەندێك جار ترجیحاتەکانی جیاوازە لەگەڵ ئـەو تەرجیحاتانـەی کـە پێـشەوا نەوەوی کردویەتی، جگەلەوەش چەندین دانـراوی هەیـە لـە بـواری : (فقـه) و (حدیث) و (تەفسیر) دا لەوانـە (حواشـی الروضـة)، (شـرح البخـاری)، (شـرح الترمذی)، (حواشي الکاشف)، بۆماوەیەکیش لە مزگەوتی (الطولونی) لە شاری قاهیرە دەرسی تەفسیری گوتوەتەوە، بەهای کوڕی (عقیل) لە بارەیـەوە دەڵـێ: بەلقینی چاکترین مـوفتی سـەردەمی خۆیـەتی. ئـەوە بـوو لـە ١٠ی مـانگی (ذی القعده)ی ساڵی (٨٠٥ ك) وەفاتی کرد.

* یەکەم دکتۆری موسڵمان لە بواری چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان بە گژوگیا:

لە ١٢ی ڕەمەزان (ابن البطار) گەیشتە (قـەیرەوان) لـە سـەفەرێکیدا کـە بـۆ لێکۆڵینەوە لە هەندێك گژوگیا، ئەو زانـا بـەڕێزە یەکـەم کـەس بـوو لـە نـاو موسڵمانەکاندا کە ببێتە دکتۆرێکی سەرکەوتوو لـە چارەسـەری سروشـتی بـە گژوگیا جگە لەوەش چـەندین کتێـب و نوسـراوی لـەوبوارەدا دانـاوە لەوانـە: (الادویه المفرده)، (الجـامع الکـبیر)، (الافعـال الغریبـه والخـواص العجیبـه)، هەریەکێك لەو کتێبانە بە گرنگترین سەرچاوەی بواری چارەسەری سروشـتی و دەرمان سازی دادەنرێن لەکۆن و نوێدا، بەکورتی مامۆسـتا (ابـن البطـار) بـە مامۆستای دکتۆرەکانی بواری چارەسەری سروشـتی بەگـژوگیا دادەنرێـت کـە هەموو ژیانی خۆی لەپێناوی خزمەت کردنی مرۆڤایەتی بەسەر برد.









* بۆ جاری دووەم مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) دەسوتێ:

لە ١٢ی ڕەمەزانی ٥ی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٤٨١ ز) – بۆ جاری دووەم مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە ئاگری تێبەربوو بەهۆی هەورە بروسکەیەکەوە (الصاعقە) لەو کاتەی بارانێکی بەخوڕ و پڕلە هەورەبروسکە باری بەسەر شاری مەدینەدا ئەوەبوو یەکێك لە هەورەبروسکەکان لە یەکێك لە بڵند گۆکانی مزگەتەکەی دا لەو کاتەدا سەردەستەی بانگبێژەکانی ئەو مزگەوتە(شێخ شمس الدین ی کوڕی خطیب) بانگی دەدا بەهۆیەوە شەهید بوو، پاشان ئاگر لە سەقفی مزگەوت و دارو دیوارو کتێب و قورئانەکان بەربوو، ئاگرەکە بەشێوەیەك بوو هەموو خەڵکی شاری مەدینە هەوڵیان دەدا نەیان دەتوانی کۆنترۆڵی بکەن و بەهۆیەوە نزیکەی ١٩ کەس بونە قوربانی، دوای ئەوە خەڵکی شاری مەدینە نامەیەکیان بۆ سوڵتان (قایت بای) میسر نوسی و داوای هاوکاری یان لێ کرد بۆ درووست کردنەوەی مزگەوت، لە بەرامبەریشدا سوڵتان هەموو کەرستەو پێداویستی بینا سازی و تەنانەت کرێکاریشی بۆ ناردن.

* لە (١٢)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٥٤ك) بەرامبەر (٣)ی ئەیلولی ساڵی (٨٦٧ز) - (احمدی کوڕی طولون) چووە ناو وڵاتی میصرەوە لەلایەن (باکباك) لەهەمان کاتدا چووەناو عێراقیشەوە .

* لە (١٢)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٦٥ك) بەرامبەر (٧)ی ئایاری ساڵی (٨٧٩ز) مزگەوتی (ابن طولون) لە شاری قاهیرە دروست کرا.







* لە (١٢)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣٣١ك) بەرامبەر (٩)ی ئایاری ساڵی (٩٤٣ز) - (توزون) چووە ناو (بەغدا) لەلایەن (ناصر الدوله ابن حمدان) و توانی دەوڵەتی عەباسی دووەم پێك بهێنێت.

* ابن جەوزی وەفات دەكات:

لە (١٢) ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٩٧ك) بەرامبەر (١٦) ی حوزەیرانی ساڵی (١٢٠٠ز) پێشەوا (ابو الفرج ی كوڕی الجوزی) ناسراوبە (ابن الجوزی) وەفاتی كرد، كە مامۆستای خەڵكی عێراق و فەرموودە ناس و شەرع و زمان زان و ڕاڤەكاری قورئان بوو، خاوەنی زیاتر لە (٣٠٠) كتێب و نوسراو بوو لە گرنگترین دانراوەكانی (المنتظم فی تأریخ الملوك والامم) وە (صفه الصفوه) وە (اخبار الاذكیاء) و چەندانی تر.

* لە (١٢)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٦٦ك) بەرامبەر (٢٥) ئایاری ساڵی (١٢٦٨ز) شاری (ئینتاكیە) (انطاكیة) فەتح كرا لەسەر دەستی (ظاهری بیبرس)، شاری ئینتاكیە كەوتۆتە خوارووی وڵاتی توركیا.

* لە (١٢)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٥ك) بەرامبەر (٢٦)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٤ز)، موسڵمانانی هەرێمی (ناراپیوات)ی وڵاتی (تایلاند) كە زۆرینەی دانیشتوانی موسڵمانن، بەهەزاران كەس لە موسڵمانان ڕژانە سەر

شەقامەکان و خۆپیشاندانێکی گەورەو بەرفراوانیان ئەنجامدا و داوایان لە حکومەتی وڵاتەکەیان دەکرد کە گیراوە موسڵمانەکان ئازاد بکات، بەڵام هێزەکانی ئاسایشی حکومەت بێڕەحمانە بەرەنگاریان بونەوەو زیاتر لە ۸۷ کەسیان لێ کوشتن.



ئەو کەسەی شەوی دوانزەهەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، پاداشتی وەك ئەوکەسە وایە کە حەفتا حەج و حەفتا عومرەی قەبوڵ کراوی کردبێت...

(پێشەوا علی)

دوعای ڕۆژی سیانزەیەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم طهرني فيه (في رمضان) من الدنس والاقذار، وصبرني فيه على كائنات الاقدار، و وفقني فيه للتقى وصحبة الابرار بعونك يا قرة عين المساكين.**



## ی ڕەمەزان

* دابەزینی کتێبی (ئینجیل):

لە (١٣)ی ڕەمەزاندا کتێبی (ئینجیل) دابەزی بۆسەر حەزرەتی عیسی پێغەمبەری کوڕی مەریەم (ﷺ).

* کلیلی دەروازەی شاری (قدس) دەدرێ بە پێشەوا عمری کوڕی خطاب:

لە (١٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٥ك) بەرامبەر (١٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٦٣٦ز) پێشەوای ئیمانداران (عمری کوری خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ



گەیشتە فەلەستین دوای ئەوەی شەڕێکی توند درووست بوو لەبەرامبەر سەربازە موسڵمانەکاندا لە کاتی گرتنی (دیار الشام) پاشان کلیلی دەروازەی شاری (قدس) درا بە پێشەوا عمر لەبەرامبەریشدا بڕیاری پاراستنی سەرو ماڵی هاووڵاتیانی دەرکرد.

* عبدالرحمن ی کوڕی هیشام دەسەڵات دەگرێتە دەست:

لە (١٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤١٤ك) بەرامبەر (٢٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٠٢٣ز) بەیعەتی خەلافەت درا بە (عبدالرحمن ی کوڕی هیشام) لە قرتبە (قرطبة) عبدالرحمن کەسێکی ئەمەوی بوو ناسراو بوو بە (مستظهر باللە)، بەڵام دەستەڵاتەکەی تەنها یەك مانگ و حەڤدە ڕۆژی خایاند.

* هاوەڵی بەڕێز (ابولبابە) وەفات دەکات:

لە(١٣)ی ڕەمەزانی (١٩)ی مانگی کانونی دووەمی ساڵی (٦٦١ ز) – هاوەڵی بەڕێز (بشر)ی کوری (عبدالمنذر)ی کوری (رفاعە) ناسراوبە (ابولبابە) وەفاتی کرد،لەسەردەمی خەلافەتی پێشەوا (علی) دا وە لە شاری قابس ی وڵاتی تونس بەخاك سپێردرا و ئێستاش خەڵکی بەلێشاو سەردانی دەکەن، ئەبولوبابە ڕەزای خوای لێ بێ خەڵکی شاری مەدینە بوو لە هۆزی بنی عەمری کوری عەوف بوو کە لەگەڵ جولەکەکاندا هاوپەیمان بوون، دوای ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بانگخوازی خۆی نارد بۆ مەدینە ئەبولوبابە پەیوەندی پێوەکردن و لەسەر دەستی ئەواندا موسڵمان بوو، پاشان بەشداری لە چەندین غەزادا کردوە کە لە گرنگترینیان غەزای (ئوحود ، بەدر) بوو، جگە لەوەش دووجار پێغەمبەر (ﷺ) وەك و جێنشینی خۆی بەسەر مەدینەدا دایناوە، ئەو بەڕێزە یەکێك بووە لەوانەی کە فەرمودەیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)






گێڕاوەتەوە، شایانی باسە دوو ئایەت لە قورئاندا ئاماژە بە دوو ڕوداوی ژیـانی ئەبولوبابە دەکەن:

١- ئایەتی (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٧) وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلاَدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ) (٢٨) (الأنفال).

واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە، ناپاکی و خیانەت مەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەر (ﷺ)، وە ناپاکی مەکەن لە سپاردەکانی ناو خۆتان لە کاتێکدا کە ئێوەش دەزانن ناپاکیە.وە بـزانن بەڕاسـتی مـاڵ و منـداڵتان هۆکـاری تـاقی کردنەوەی ئێوەن، وە بەڕاستی لای خوا پاداشتی زۆر گەورە هەیە.

ئەمەش لەو کاتەدا هاتە خوارەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ماوەی (٢٥) شـەو گەمارۆی قەڵاکانی جولەکەی (بني قريضه)ی دا لـە مەدینـە، ئـەوە بـوو کـە زۆریان بۆ هات داوایان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) کە (ابولبابه) بنێرێ بۆ لایان تا قسەی لەگەڵدا بکەن، ئەوە بوو ئەبولوبابە چووە لایـان کاتێـك جولەکـەکان ئەبولوبابـەیان بینـی لەبـەری هەڵسان و پێـشوازیان لێ کـرد، ئـافرەت و منداڵەکانیان بە گریانەوە بەرەو ڕووی هاتن و وتیان ئێمە لەسەر حکم و بڕیاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) دادەبەزین ئەبولوبابە وتی بەڵێ، دەستیـشی بـە ملـی خۆیدا هێنا وەکو ئەوەی بڵێ ئەگەر دابەزن سەرتان دەبڕن، پاشان هەستی کـرد کە شتێکی زۆر خراپی کردووە، وا هەستی کرد کە خوای گەورە بە هـۆی ئـەو کارەیەوە رقی لێی بۆتەوە، بۆیە نان و ئاوی لە خۆی حەرام کـرد، پاشـان بـۆ ئەوەی لەو گوناهە پاك بێتەوە چووە مزگـەوتی پێغەمبـەر (ﷺ) و خـۆی بـە کۆڵەکەی مزگەوتەکەوە بەستەوە بۆ ماوەی شەش شەو بەو کۆڵەکەیەوە مایەوە





تاوای لێهات هێزی لێبڕا لە برسێتی و تینوێتی دا ( جێگەی باسە ئێستاش ئەو کۆڵەکە لەمزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بە ناوی (ابی لبابە) بەناو بانگە).

٢- ئایەتی دووەمیش هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ (و اخرون اعترفوا بذنوبهم) کە ئاماژە بە لێخۆش بوونی ئەبو لوبابە دەکات، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات و بە دەستی موبارەکی خۆی ئەبولوبابەی لە کۆلکەکە کردەوە و مژدەی لێخۆش بونی خوای پێدا.

* جارێکی تریش نەخۆشی تاعون بڵاو دەبێتەوە:

لە ١٣ی رەمەزان و لە سەردەمی دەسەڵاتی (عبدالله کوڕی زبێر) دا نەخۆشی (طاعون) کە پێی دەوترا (الطاعون الجاف) لە حیجاز بڵاو بوویەوە، بۆیە پێ دەوترا (الطاعون الجاف) چونکە هەرکەس ئەونەخۆشیەی بگرتایە لە ئاستی خۆی وشك دەبووەوەو هەرگیز رزگاری نەدەبوو لێی، شایانی باسە زیاتر لە ٢٠٠ هەزار کەس بەهۆی ئەو نەخۆشیەوە مردن و ٨٠ کەسیان لە کوڕو نەوەکانی هاوەڵی بەرێز (انس کوڕی مالك) بوون.(رەزای خوای لێ بێ)

* سوڵتان (مرادی یەکەم) شەهید دەکرێت:

لە ١٣ی رەمەزانی ١٥ی مانگی تشرینی دووەمساڵی (٦٩٨ ز) سوڵتانی عوسمانی (مرادی یەکەم) شەهید کرا، دوای ئەوەی کە (بۆسنەو هێرسك)ی فەتح کرد. دوای ئەوە (لازار)ی مەلیکی صربەکان سوپایەکی گەورەی ئامادە کرد کە پێك هاتبوو لە (صرب و بۆسنەو هرسك و ئەفلاف و بەغدان) ، هەموویان پەیمانیان دا کە رووبەڕووی موسڵمانەکان ببنەوە و دەوڵەتی عوسمانیەکان بڕوخێنن، کاتێك دەنگوباس گەیشتەوە بە سوڵتان، تەپڵی شەڕی لێدا، هێزی موسڵمانەکان ئامادە بوون و کەوتنە رێ تا گەشتنە شوێنێك کە پێی دەوترا







(سـها) یـان (سـهو) لەوێـدا هـەردوو سـوپا بەیەکیانـدا داو موسـڵمانەکان سـەرکەوتن، دوای کۆتـایی هـاتنی شـەڕەکە و لەوکاتـەی سـوڵتان بـەناو کوژراوەکاندا دەگەڕا یەکێك لـە سـەربازە صـربییەکان کـەناوی (ملیـوك) بـوو هەڵسایەوەو ڕمێکی کوشندەی لە سوڵتان (مراد) داو ئەوەبوو بەهۆیەوە شەهید بوو.

* لە ١٣ی ڕەمەزاندا یەکەم نوێـژی هـەینی لـە مزگـەوتی (الجیـوش) سـوپا لەشاخی (المقطـم) ی قـاهیرە ئـەنجام درا. ئـەم مزگەوتـە لەلایـەن (بـدر الجمـالی) (والی) عـەککا درووسـت کراوە.




* مردنی یاسر عەرەفات:

لە ١٣ی ڕەمەزاندا سەرۆکی دەسەڵات دارێتـی فەلەسـتین (یاسـر عـەرەفات) کۆچی دوایی کرد.(محمد عبدالرؤوف القدوة الحسینی) ناسراو بە (یاسـر عـەرەفات) یـان (ابو عمار) لە مانگی ئابی ساڵی (١٩٢٩ ز) لـە شـاری قـاهیرە لـەدایك بـووە. کۆلێـژی هەندەسەی لە زانکۆی قاهیرە تەواو کردووە و لەتەمەنی گەورەیی دا ژنی هێنـاوە و تـەنها یەك کچی لە خێزانەکەی بووە. ئـەوەبوو لـە ناکـاو بـاری تەندروسـتی تێکـچوو و



یاسر عەرەفات.

**گواسترایەوە بۆ فەرەنساو لە ٢٠٠٤/١١/١١ز بەفەرمی وەفاتی یاسر عەرەفات راگەیەنرا. بەڵام ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە هەموو دکتۆرەکانی فەرەنسا نەیان توانی هۆکاری نەخۆشیەکەی بزانن و تائێستاش گومان لە هۆکاری مردنەکەی هەیە.**

هەرکەسێك شەوی سیانزەیەمی مانگی رەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە، پاداشتی وەك ئەوکەسە وایە کە سەردانی مزگەوتی (الاقصی) قودس و سەردانی مەرقەدی پێغەمبەران و پیاوچاکانی دەورو بەری قودسی کردبێت...
(پێشەوا علی)



دوعای ڕۆژی چواردەیەمی مانگی ڕەمەزان:

اللهم لا تواخذني فيه (في رمضان) من العثرات، و اقلني فيه من الخطايا و الهفوات، ولا تجعلني فيه غرضا للبلايا و الآفات بعزتك يا عز المسلمين.





ی
ڕەمەزان

* گرتنی سەرقوسە:

لە (١٤)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٦٤ك) بەرامبەر (١٩) ئاباری ساڵی (٨٧٨ز) موسڵمانان توانیان دەست بگرن بەسەر شاری (سەرقوسە) لە جەزیرەی سەقلیە (صقلیە).

* دانانی بەردی بناغەی زانکۆی ئەزهەر:

لە (١٤)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣٥٩ك) بەرامبەر (٢٠)ی تەموزی ساڵی (٩٧٠ز) بەردی بناغەی زانکۆی ئەزهەر لە قاهیرە دانرا و لەماوەی نزیکەی دوو ساڵ دا تەواو بوو.











* لەدایك بوونی (عبدالرحمن الناصر) ئەمیری ئەندەلوس:

لە (١٤)ی ڕەمەزانی مانگی ٥ی کانونی دووەمی ساڵی (٩٨٨ ز) (عبدالرحمن الناصر) ئەمیری ئەندەلوس چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەدایك بوو، لە تەمەنی دە ساڵی یەوە هەوڵی فێربوون و شارەزا بوونی قورئانی پیرۆزی داوە، لەبواری زانستەکانی نەحو و (شیعر) و مێژوودا شارەزایی باشی هەبووە، جگەلەوەش توانیویەتی ئەمن و ئاسایش بەرقەرار بکات لە ئەندەلوس دا، سەرەڕای بونی چەندین کۆسپ و لەمپەر لە بەردەمیدا بەتایبەت دەستی ئاژاوەگێڕی لە ناوخۆو دەرەوەی وڵاتەکەیدا. لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتوبوونی ئەمیری ئەندەلوس:

١- بوونی پەیوەندی پتەو لەگەڵ گەلەکەیدا.

٢- بەشداری کردنی لە خۆشی و ناخۆشیاندا.

٣- بەبەزەیی بوون بەرامبەر هاووڵاتیانی وڵاتەکەی بەبێ جیاوازی.

* درێژترین سفرەو خوانی ڕۆژو شکاندن:



درێژترین سفرە و خوان لە جیهاندا







لە (١٤)ی مانگی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٣١ك)بەرامبەریـە (٢٠١٠/٨/٢٤ز) شارەوانی (ئەستەنبوڵ) لە داهێنانێکی تـازەدا تـوانی درێـژترین و گـەورەترین سفرەوخوانی ڕۆژو شکاندن ڕێك بخات کە تێیدا سـفرەیەکی (١٠) کیلۆمـەتری ڕاخراو ژمارەی مێزەکانی (٧) هەزار مێز بوو، ژمارەی ئامادەبوانی خوانەکەش زیاتر لە (٤٢) هەزار کەس بوو لە ژن و پیاو، شایانی باسە ئەو خوانە زیاتر لە (١٠) تەن برنج و (٨) تەن گۆشت و (٥٠٠) سینی پاقلاوەی تێدا دانـرا. ئـەم کارەش دەنگۆیەکی گەورەی لێ کەوتەوە لـە نـاو ڕاگەیاندنـە جیهانیەکانـدا و داواکرا بخرێتە ناو فەرهەنگی (جنز) بۆ ژمارە پێوانەیی یەکان.[٢]

* مردنی سوڵتان (مظفرالدین)ی هەولێری:

لـە ١٤ ڕەمـەزانی سـاڵی (٦٣٠ ك) بەرامبەریـە (٢٤)ی حـوزەیرانی سـاڵی



[٢] گوگڵ – اطول مأدبة افطار في تركيا.



(١٢٣٣ ز) سوڵتان موزەفەر (مظفرالدين كوكبوری) ئەمیری هەولێر وەفاتی کرد. [١]

سوڵتان موزەفەر یەکێك بوو لەو سەرکردانەی کە شان بەشانی (صلاح الدینی ئەیوبی) لە دژی خاچ پەرستەکان شەڕی دەکرد، سوڵتان موزەفەر لە پاڵ (زیدالدین علی کوڕی بکتکین)ی باوکیدا گەشەی کرد کە حاکمی هەولێر بوو، باوکی سوڵتان موزەفەر بڕیاری دابوو کە هەرلە منداڵیەوە فێری ڕۆشنبیری و پەروەردەو سوارچاکی و هونەری شەڕ و ... هتد، بکات. پاشان باوکی لە ساڵی (٥٦٣ ك – ١١٦٧ ز) وەفاتی کرد و سوڵتان موزەفەری لە دوای خۆی دانا بە حاکمی هەولێر کە ئەوکات تەمەنی ١٤ ساڵ بوو، بەڵام لەبەر کەم تەمەنی نەیتوانی کاروبارەکان بەجوانی بەڕێوە ببات بۆیە ناچار بڕیاری دا جێگرەکەی کە ناوی (مجاهدالدين قايماز) بوو کاروباری دەوڵەت بەڕێوە ببات ئەمەش وایکرد کە سوڵتان تەنها بە ڕواڵەت دەسەڵاتی بێنێ، کاتێک سوڵتان موزەفەر گەورە بوو کێشە کەوتە نێوان ئەو و (مجاهدالدين) لەسەر دەسەڵات، ئەوەبوو کێشەکە بە دورخستنەوەی (مجاهدالدين) کۆتایی پێهات، بەڵام لە شوێنی ئەودا (زين الدين يوسف)ی برای سوڵتان موزەفەر کرا بەحاکمی دەوڵەت و (موزەفەرەدین) دورخرایەوە لە دەسەڵات، تا ئەوکاتەی کە (زين الدين يوسف) لە ساڵی (٥٨٦ ك) بەرامبەر (١١٩٠ ز) کۆچی دوایی کردو سوڵتان موزەفەر بەفەرمی بوویە حاکمی هەولێر، ئا لێرەوە دەوری سوڵتان موزەفەر دەردەکەوێت کە جگە لەوەی لە بواری سیاسەت و بەڕێوەبردنی دەوڵەت دا

---

[١] کوکبوری وشەیەکی تورکیەو بەمانای گورگی شین دێت هەربەو ناوەشەوە بەناوبانگ بوو ئەویش لەبەر ئازایەتی و چاونەترسی و هەڵمەت بەرزی سوڵتان بوو.


کەسێکی کارامە بوو لەھەمان کاتدا لە بواری خزمەت کردنیش دا دەستێکی بالأی ھەبووە، بەتایبەت لەم بوارانەدا:

١- ڕێزگرتنی زانایانی ئاینی ئیسلام و کار ئاسانی کردن بۆیان بۆ بلاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامی پیرۆز و ھوشیارکردنەوەی خەڵکی لە خراپەو خراپەکاری.

٢- گرنگی دان بە حوجرەو خویندنگا شەرعیەکان.

٣- بەشداری کردن لە خۆشی و ناخۆشی خەڵکیدا.

٤- دروست کردنی قوتابخانە.

٥- دروست کردنی نەخۆشخانە کە دیارترینیان نەخۆشخانەی سولتان موزەفەرە لە شاری ھەولێر کە تائێستاش کارەکانی بەردەوامەو ڕۆژانە بەدەیان کەس سەردانی دەکەن.

٦- دانانی ئاھەنگی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) کە تێیدا باس لە ژیان و پەیامی ئەو سەروەرە دەکراو پاشان شیرینی بەسەر ئامادەبواندا دابەش دەکرا.

٧- دروست کردنی شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ خاوەن پێداویستیە تایبەتەکان و سەردان کردنیان و دابین کردنی پێداویستیەکانیان.

٨- دروست کردنی شوێنی تایبەت بۆ ئەومندالأنەی کە دایك و باوکیان نەماوەو کەس نیە بەخێویان بکات.

٩- دیاری کردنی شوێنێکی تایبەت بۆ ئەوکەسانەی کە توشی نەخۆشی گەڕی و بەڵەکی یان ھەر نەخۆشیەکی تر بوو بوون کە بەرامبەر لێی دەترسێ یان قێزی لێدەکاتەوە، وە دابین کردنی ھەموو جۆرە پێداویستیەك بۆیان، جگەلەوەش بۆ ھەر نەخۆشێك کەسێکی دانابوو تا خزمەتی بکات.

١٠- دروست کردنی شوێنی تایبەت بۆئەو گەشتیارانەی رویان دەکردە ھەولێر، بۆ ئەوەی تێیدا بحەوێنەوە تا کارەکانیان تەواو دەبێت، جگەلەوەش بەشێکی





تایبەتی دیاری کردبوو تا یارمەتی مادی بدا بەگەشتیاران ئەوانەی باری ئابوریان لاوازە.

١١- درێژکردنی دەستی هاوکاری بۆ خەلکی فەقیرو هەژاری هەردوو شاری پیرۆزی مەککە و مەدینە، کە سالآنە خواردن و جل و بەرگ و چەندین پێداویستی تری بەرێ دەکرد کە بە ٣٠ هەزار دینار دەخەملێنرا، لەوێ دابەشی دەکرد بەسەر هەژاراندا.



شوێنی مانەوەی (سلطان مظفر) لە شاری هەولێر

١٢- دروست کردنی چەند عەمبارگەیەکی هەلگرتنی ئاوی باران تا دانیشتوانی ئەوشارە سودی لێ وەرگرن بەتایبەت حاجیانی مالی خوا.

١٣- خەم خواردن لە ئەسیرو بەندکراوەکان ئەوانەی لە ژێر دەستی خاچ پەرستەکاندا بوون بۆ ئەومەبەستە نوێنەری تایبەتی خۆی ناردە لای خاچ پەرستەکان و داوای کرد کە بەندکراوەکان ئازاد بکەن، ئەوە بوو لەماوەی

دەسەڵاتی خۆیدا توانی ژمارەیەکی بەرچاو لە بەندکراوەکان ئازاد بکات کە ژمارەیان (٦٠)هەزار کەس بوو لە ژن و پیاو. سوڵتان توانی نیو سەدە حوکمی هەولێر بکات و تا تەمەنی گەیشتە ٨٠ ساڵ، پاشان لە ڕۆژی چوارشەممە لە ٨ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٣٠ ك) بەرامبەر بە (١٢٣٢ ز) لە هەولێر وەفاتی کرد، پێش ئەوە وەسیەتی کردبوو کە لە شاری مەککە بنێژرێت، خەڵکی بەکاروانێك بەڕێ کەتن تا بیبەن لەوێ بینێژن، بەڵام لە ڕێگەدا کۆمەڵێك بەربەست هاتنە پێش نەیان توانی بیگەیەننە ئەوێ، ئەوەبوو گەڕانەوە لە کوفە لەپاڵ پێشەوا عەلی بەخاکیان سپارد.

*فەتح کردنی شاری ئەنتاکیە:

لە (١٤)ی ڕەمەزان ی ٢٨ی مانگی ئایاری ساڵی (١٢٦٨ ز) – سوڵتان (الملك الظاهر) توانی شاری (ئەنتاکیە) فەتح بکات کە سەرپەرشتیاری شارەکە (ئەغرس) بوو یەکێك بوو لە سەرسەخت ترین دوژمنەکانی ئیسلام کە زۆر ئەشکەنجەی موسڵمانانی دەدا و چەندین کەسی بێتاوانی لێ دەستگیر کردبوون. پێش ئەوەی هێزەکانی سوڵتان بچنە ناو شارەکەوە دانیشتوانی شارەکە هاتنە لای سوڵتان و داوای ئەمانیان کرد و کۆمەڵێك مەرجیان بۆ سوڵتان دانابوو، بەڵام سوڵتان ئامادە نەبوو وەڵامیان بداتەوە و بەدەستی بەتاڵ گەڕانەوە ئەوەبوو لە ماوەیەکی کەمدا شارەکەی ڕزگار کرد و هەموو بەندکراوەکانی ئازاد کرد.

* گەنجێك دەسەڵات دەگرێتە دەست:

لە (١٤)ی ڕەمەزانی ساڵی (٧٤٨ك) بەرامبەریە ساڵی (١٣٤٧ ز) سوڵتان (حسن ی کوڕی ناصر محمد قلوون)، بویە دەسەڵات دار لە کاتێك دا کە تەمەنی بچوك بوو بۆیە وەکو پێویست نەیدەتوانی کارەکانی بەباشی بەڕێ بەرێوە. لەگەڵ تەمەنە بچوکە کەمیدا خاوەنی گەورەترین شوێنەواری ئیسلامی بوو لەمیسر، کە ناسراو بوو بە قوتابخانەی سوڵتان حسن.







* لە (١٤)ی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٦٥ ك بەرامبەر (٣)ی ئابی ساڵی(١٨٤٩ ز) – محمد علی پاشای گەورە حاکمی میسر وەفاتی کرد.

* لە (١٤)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٤١١ ك) بەرامبەر(١٩٩١/٣/٣٠ ز) و لە مانگی ڕەمەزاندا بوو کە کۆڕەوە مەزنەکەی گەلی کورد ڕوویدا کە (سێ ملیۆن) خەڵکی کوردستان بەرە و سنوورەکانی ئێران و چەند وڵاتێکی دراوسێ لە ترسی هێزەکانی حیزبی بەعس ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشت و چەندین کەس لەبەر ماندوبەتی و برسێتی و تینوێتی گیانیان لەدەست دا لەو ڕێگە هات و نەهاتەی نێراندا.



ئەو کەسەی شەوی چواردەیەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، پاداشتی وەکو ئەوکەسە کە شەوی پیرۆز (لیلە القدر)ی بەنسیب بووە و لە ئێوارەوە تا بەیانی لە نێوان دەرگای کەعبەو (مقام)ی ابراهیم دا نوێژی کردووە...
(پێشەوا علی)







دوعای رۆژی پانزەیەمی مانگی رەمەزان:

**اللهم ارزقني فيه (في رمضان) طاعة الخاشعين، واشرح فيه صدري بانابة المخبتين، بأمانك يا أمان الخائفين.**



**ی ڕەمەزان**

* لەدایك بوونی پێشەوا (حسن)ی کوڕی (علی):

لە (١٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣) ك بەرامبەر (١)ی ئازاری ساڵی (٦٢٥ ز) پێشەوا (حسن ی کوڕی پێشەوا علی کوڕی ئەبوتالب) لە دایك بوو.

* عبید الله ی کوڕی پێشەوا عمری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) وەفاتی کرد: لە (١٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣٧ ك) بەرامبەر (٢٣)ی شوباتی ساڵی (٦٥٨ز) عبید الله ی کوڕی پێشەوا عمری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) وەفاتی کرد.

* هەوڵێك بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی ئەمەوی:

لە (١٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٨ك) بەرامبەر (٢٠)ی شوباتی ساڵی (٧٥٦ ز) (عبد الرحمن داخل) ی ناسراو بە (صقر قریش) بە دەریادا تێپەری بۆ ئەندەلوس تا دەوڵەتێکی ئیسلامی بەهێز دروست بکات، کە ئەویش دەوڵەتی ئەمەوی بوو لە ئەندەلس.

* قەڵایەك تەسلیم بە سوڵتان صلاح الدین ی ئەیوبی دەکرێت:

لە (١٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٨٤ ك) بەرامبەربە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١١٨٨ ز) قەڵای (صفد) تەسلیم بە سەرکردەی موسڵمان صلاح الدین ی ئەیوبی کرا.







* محمدی کوڕی پێشەوا ئەبوبەکری صدیق دەبێتە (والی) لە (میسر):

لە ١٥ ڕەمەزانی ٢٤ی مانگی شوباتی ساڵی (٦٥٨ ز) (محمدی کوڕی پێشەوا ئەبوبەکری صدیق) گەیشتە میسر و بووە والی بەسەر میسردا، کە لەلایەن پێشەوای ئەوکاتەی موسڵمانان (علی کوری ئەبوتالب)ەوە نێردرا بوو، ئەوەش لەدوای مردنی (ئەشتەری کوڕی مالك) (والی) میسر.

هەر کەسێك شەوی پانزەیەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە، وەکو ئەوکەسە وایە کە خوای گەورە دوعاکانی لێ قەبوڵ کردووە و پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێ کردووە... (پێشەوا علی)

بۆئەوەی مێژو تاکۆتا درۆیێ نەوەندە بەسە کە یەك کەس ڕاستیەکان بشارێتەوە. (وتە)



دوعای ڕۆژی شانزەیەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم وفقني فيه (في رمضان) لموافقة الابرار، وجنبني فيه مرافقة الاشرار، و اوني فيه برحمتك الى دار القرار بإلهيتك يا اله العالمين.**



ی

ڕەمەزان

* ابوجعفری مەنسور دەکوژرێت:

لە (١٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٣٢ ك) خەلیفەی عەباسیەکان (ابوجعفری مەنسور) لەو کاتەی کە دەوڵەتی عەباسیەکان بە قۆناغێکی هەستیارو مەترسی داردا تێ دەپەڕی کە دوژمنان ی دەرەکی هەوڵی لەناوبردنیان دەدا، لەوکاتەناسکەدا خەلیفە کوژرا.

* زانای حیجازی وەفات دەکات:

لە (١٦)ی ڕەمەزانی ساڵی(٨١٧ ك) شەرع زانی حیجازی (محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی ظهیرة) مامۆستای (ابن حجر) لە شەوی هەینی (١٦)ی ڕەمەزان دا کۆچی دوایی کرد. ئەو زاتە لە شەوی جەژنی ڕەمەزاندا لە شاری مەککەی پیرۆز و لە ساڵی (٧٥١ ك) لەدایك بووە و لە سەردەستی زانایانی مەککە دا زۆرێك لە زانستەکانی خوێندووە و لە پێناو فێربوونی زانست دا چووەتە وڵاتی میسرو شام و زانستی خوێندووە و هەر لەوێشدا نازناوی زانای حیجازی پێ دەبەخشرێت، دەبێتە موفتی و لە شوێنە دورەکانەوە خەڵك بۆ وەڵامی پرسیارەکانیان ڕویان تێدەکرد، بە تایبەت بۆ ماوەی چل ساڵ وانە ئیسلامی یەکانی وتوەتەوە و لە زۆرێك لە وڵاتەکانەوە قوتابیان ڕویان تێکردوە بۆ خوێندنو فێربونی وانە ئیسلامیەکان. لە دیارترین قوتابیەکانی پێشەوا (ابن حجر)ە.





* هەردوو گوندی گۆڕتەپە و عەسکەر لە ناحیەی ئاغجەلەر (کیمیا) باران دەکرێن.

لە (١٦)ی ڕەمەزان ١٩٨٨/٥/٣ز لە ئێوارەیەکی درەنگی مانگی ڕەمەزاندا و لەکاتژمێر (٥:٤٠) ئێوارە و نیوکاتژمێر پێش ڕۆژوو شکاندن شەش فڕۆکەی جۆری میك هەڵیان کوتایە سەر گوندی گۆڕتەپەو بە چەکی کیمیاوی بۆردومانیان کرد، گۆڕتەپە لە تورکیدا بەمانای (گردی سەوز) دێت، ئەم گوندە لە دێرزەمانەوە ئاوەدان بووە و ژمارەی ماڵەکانی نزیکەی (٥٠٠) ماڵ بووە،

گوندی گۆڕتەپە لە ناحیەی ئاغجەلەر



جگە لەوەش هەردەم لانەی هێزی پێشمەرگە بووە، ئەوەبوو ڕژێمی بەعس هێرش و پەلاماری ئەنفالی چواری بە کیمیابارانی ئەم دوو گوندە دەست پێ کرد کە تێیدا زیاتر لە (٣٠٠)کەس تەنها لە گۆڕتەپەدا بوونە قوربانی و کوژران، هەندێك لە خەڵکی ئەو گوندە دەڵێن نزیکەی (٥٠٠) کەسی تێدا

کوژراوە، هەندێك لە کوژراوەکان لە زەویەکانی خۆیاندا نێژراون و هەندێکیشیان لە ئاوی (زێ)دا خنکاون و هەندێکیشیان لەبەردەم مزگەوتەکەدا چاڵێکی گەورەیان بۆ هەڵکەنراوەو بە کۆمەڵ نێژراون.

گوندی عەسکەریش کە دوای کەمێك لە بۆردومان کردنی گۆپتەپە بۆردومان کرا بە چەکی کیمیاوی لەئەنجامدا (٦٩) کەس لەو گوندە شەهید بوون.



- عبدالقادر عبدالله عەسکەری دەڵێ: پۆلێك فڕۆکەی جۆری میك هەڵیان کوتایە سەر گوندەکەو لە ناکاو گوێمان لە هاژەی فڕۆکەکان بوو هەشت تەقینەوەی گەورەیان درووست کردو پاشان دوکەڵێکی سپی بۆن خۆش بڵاو بوویەوە، ئێمە ئەوکاتە لەدەرەوەی گوندەکەمان بووین کە فڕۆکەکان ڕۆشتن بەرەو گوندەکەمان گەڕاینەوە وامانزانی وەکو جارانی تر، چونکە خەڵکی لەگەڵ ئەوحاڵەتەدا ڕاهاتبوون، بەڵام دوایی لەهۆش خۆم چووم و ئاگام لەخۆم نەما.

- محمد کانەبی کە دانیشتووی گوندی گۆپتەپە بووە دەڵێ: ئێمە لەسەر ئاوی (زێ) بووین دایکم خەریکی نان کردن بوو لەوکاتەی کە فڕۆکەکان هێرشیان








کردە سەر گوندەکە لەکاتی بۆن کردن دا دایکم بۆنەکەی ناسیەوە کە ئەوە بۆنی کیمیاویە بۆیە یەکسەر (کەواکە)ی بەری داکەند و تەڕی کردو بەسەر من و خوشکەکەم و براکەمی دا داو بەوشێوەیە خوای گەورە ئێمەی رزگارکرد.

پاشان ئەو خەڵکانەی کە رزگاریان بوو بەساغی یان بە بریندداری هەوڵیاندا خۆیان بگەیەننە شوێنە سەلامەتەکان، لەبەر ئەوەی رژێم ئاوەکەی دوکانی بەردابوویەوە و زۆر زیادی کردبوو کەس نەیدەوێرا لێی بپەڕێتەوە بۆیە ناچار رزگاربووان بەرەو کۆمەڵگە زۆرەملێ کانی تەکیەو باینجان رۆشتن.

* لە (١٧)ی مانگی رەمەزانی (٤)ی نیسانی ساڵی ١٩٨٨ز رژێمی بەعس لە هەموو لایەکەوە هێرشێکی بەرفراوانی پیادەی کردە سەر گوندەکانی ئەو ناوچەی ئاغجەلەر بەم شێوەیە شێوەیە :

- هێزێك لە چەمچەماڵ و تەکیەوە بەرەو ناحیەی ئاغجەلەر کەوتە ڕێ.
- هێزێك لەناوچەی تەقتەقەوە بەرەو گوندەکانی لێواری زێی بچوك و شێخ بزێنی و گۆپتەپە کەوتە ڕێ.
- هێزێك لە قەزای کۆیەوە بەرەو گوندەکانی نزیك ئەو قەزایە کەوتە ڕێ.
- هێزێك لە سوسێوە بەرەو سورقاوشان و گوندەکانی دەورو بەری کەوتە ڕێ.

هەموو ئەم هێرشانە بە پلانێکی پێش وەختەی نەخشە بۆداڕێژراو و بە فەرماندەیی لیواڕوکن (سوڵتان هاشم) بوو، لە ئەنجامدا (٧٢١) کەس لە ژن و منداڵ و پیاوی ئەو ناوچەیە بێ سەر و شوێن کران.

* زیاتر لە (٦) هەزار کورد لە چەمی (بابروشە)ی ناحیەی ئاغجەلەر ئەنفال کران و بێسەروشوێن کران:





لە (٢٨)ی مانگی ڕەمەزانی ڕۆژی ١٩٨٨/٥/١٧ز هێزێکی سوپای عێراقی چوونە چەمی (بابروشە) لە سنووری گوندەکانی (جەلەمۆرد)و (توتەقەڵ)و (چوخلیجە)ی سەربە ناحیەی تاغجەلەر و زیاتر لە (٦) هەزار گەنج و پیر و منداڵی ئەوناوچەیەیان گرت و ڕاپێچیان کردن و بێسەرو شوێنیان کردن.

* مێژو نووسی جیهانی ناودار (احمدی کوڕی علی مقریزی) وەفاتی دەکات:
لە (١٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨٤٥ ك) بەرامبەر (٢٧)ی کانونی دووەمی ساڵی (١٤٤٢ ز) زانای مێژو نووسی جیهانی ناسراو (احمدی کوڕی علی مقریزی) وەفاتی کرد. خاوەنی کتێبی (المواعظ والاعتبار فی ذکر خططین والاثار).



* ناپلیۆن خۆی دەکوژێت:
لە (١٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٢١٣ ك) بەرامبەر (٢٠)ی شوباتی ساڵی (١٧٩٩ ز) کەسایەتی ناوداری جیهانی (ناپلیۆن) خۆی کوشت.

* موفتی دیاری میسری لەدایك دەبێ:
لە ١٦ای ڕەمەزانی ساڵی (١٣٠٧ ك) بەرامبەر بە ساڵی (١٨٩٠ ز) – زانای گەورە ( حسنین محمود حسنین مخلوف) موفتی وڵاتی میسر لەدایك بوو.

* لەدایك بوونی (قاضی القضاة):
لە ١٦ی ڕەمەزانی ٢٠ی مانگی تەموزی ساڵی (١٣٦١ ز) – زانای ناودارو ناسراوی مێژو و (قاضی القضاة) (بدرالدین ابی محمد محمود ی کوڕی احمد العینی)، چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لە دایك بوو، ئەو زانا بەڕێزە یەکێکە لەو کەسانەی شەرحی (صحیح البخاری) یان کردووە لەژێر ناوی (عمدە القاری

بشرح صحيح البخاری) کە (٢٥) جوزئەو خۆی لە (١٢ مجلد) دا دەبینێتەوە و چاکترین شەرحە لەهونەری فەرمودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) کرابێ، زانای مێژو نووس (ابن خلدون) لەبارەیەوە دەڵێ: (صحيح البخاری) قەرزە لەسەر موسڵمانان و کەس نەیتوانیوە ئەو قەرزە بداتەوە تەنها دووکەس نەبێ :

١- پێشەوا عینی – کە (عمده القاری) نوسیوە لەسەر صحيح البخاری.

٢- ابن حجر العسقلانی – کە (فتح الباری) نوسیوە لەسەر صحيح البخاری کەخوی لە (١٣ مجلد) دەبینێتەوە.

* ئافرەتێك دەبێتە سەرۆکی دەوڵەت:

لە ١٦ی ڕەمەزانی ساڵی (١٦٥١ ز) – ئافرەتی ناوداری مێژو خاتو (خەدیجە تارخان) پۆستی سەرۆکایەتی دەوڵەتی عوسمانی بەبریکار لە جیاتی کوڕە بچکۆلەکەی وەرگرت کە ئەوکات کوڕەکەی تەمەنی نەگەشتبووە (٧) ساڵان، (خەدیجە) بەئەسڵ (تۆکران)ی بوو لەتەمەنی ٢٤ ساڵی ئەوپۆستەی وەرگرت کاتێکیش کوڕەکەی گەورە بوو دەستەڵاتەکەی لێ سەنرایەوە و درایەوە بە کوڕەکەی، خەدیجە لەتەمەنی ٥٦ ساڵی و لە ساڵی (١٦٨٣ز) وەفاتی کرد.

ئەو کەسەی شەوی شانزەیەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، لەو کاتەی کە لەقەبرەکەی هەڵدەسێتەوەو زیندو دەکرێتەوە دەڵێ :

﴿ أشهدُ أن لا إلهَ إلا اللهُ وأن محمَّداً رسولُ الله ﴾...

(پێشەوا علی)

داخ بۆ رابردوو مەخۆ و لە تواناکانی ئێستات سود وەربگرە. ئەگەر نەت توانی یارمەتی لە کەسانی تر وەر بگرە. (وتە)



دوعای ڕۆژی حەڤدەیەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم اهدني فيه (في رمضان) لصالح الأعمال، واقض لي فيه الحوائج و الامال يا من لا يحتاج الى تفسير و السؤال، يا عالما بما في صدور العالمين صل علي محمد و اله الطاهرين والصحابة اجمعين.**



ی

ڕەمەزان

* شەڕی بەدر ڕووی دا:

لە (١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢) کۆچی بەرامبەر (١٣)ی ئازاری ساڵی(٦٢٣ ز) شەڕی بەدر(بدر) لە نێوان موسڵمانەکان بە سەرۆکایەتی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) و بێ باوەڕەکاندا روی دا، بووە یەکەم سەرکەتنی هێزی ڕاستی بەسەر هێزی ناڕاست و باطل دا، کە دواجار ناوی نرا شەڕی (الفرقان).

* ڕوقیەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) وەفات دەکات:

لە (١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢)ی کۆچی بەرامبەر (١٣)ی ئازاری ساڵی (٦٢٣ ز) حەزرەتی خاتوو ڕوقیەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد.

* حەزرەتی خاتو (عائشە) وەفات دەکات:

لە شەوی سێ شەممەی (١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨٥ ك) بەرامبەریە (١٢)ی تەموزی ساڵی (٦٧٨ ز) دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد و لە قەبرستانی بەقیع نێژرا.

* وا معتصما:

لە (١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٢٣ ك) بەرامبەر (١٢)ی ئابی ساڵی (٨٣٨ ز)، لەو کاتەی کە ئافرەتێکی هاشمی موسڵمان لەلایەن دەوڵەتی بیزەنتیەکانەوە





(بیزنطیة) دەستگیرکراو ئەزیەت دەدرا ئەویش هاواری کردو وتی (وا معتـصما) ئەویش لە وەڵامی ئەو ئافرەتەدا سوپایەکی گەورەی ڕێك خست و بەرێی کرد بۆ تەمێ کردنی بیزەنتیەکان کە خۆی سەرۆکایەتی سوپاکەی دەکرد. ئـەوە بـوو توانی بچێتە ناو شاری (عموریە)و سەرکەوێ بەسەریانداو ئافرەتەکەش ڕزگـار بکات و دوای ئەوە ئافرەتەکەی لەناو شاری (عـموریە)دا بینی و پێـی وت: لای باپیرت شایەتیم بۆبدە کە من بۆ ڕزگارکردنی تۆ هاتم.(مەبەستی لە باپیری ئەو ئافرەتە پێغەمبەری خوایە ﷺ ).

* کورسی دەسەڵات جێ دەهێڵێ:

لـە (١٧)ی ڕەمـەزانی سـاڵی (٧٠٩ ك) بەرامبـەر (١٧)ی شـوباتی ساڵی(١٣١٠ز) سوڵتان (بیبرس) تەنازولی کرد لە کورسـی دەسـەڵاتی میسر



دوای تێپەڕبوونی ساڵێك و نیو بەسەر دەسەڵاتەکەیدا.

* ئەبوجەهل کوژرا:

لە (١٧)ی مانگی رەمەزانی سالّی (٢ ك) ئەبوجەهل لە غەزای بەدری گەورەدا کوژرا.

**پێشەوا (علی) شەهید دەکرێت:**

لە ١٧ی رەمەزانی ٢٨ ی کانونی دووەمی سالّی (٦٦١ز) پێشەوا (علی کوڕی ئەبوتالب) (ﷺ) لەوکاتەی کە دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی لەمزگەوتی کوفە لەلایەن کەسێکەوە بەناوی (عبدالرحمن ابن ملجم) شەهید کرا، خەلافەتەکەی تەنها چوار سالّ و نۆ مانگی خایاند، پێش ئەوەی گیانی بسپێرێ بانگی (حسن و حسین) ی کوڕی کرد و وەسێتی بۆکردن و فەرمووی ( لەخوا بترسن و تەقوای خاتان هەبێ و دونیا هەلّتان نەخەلّەتێنێ و لەخشتەتان نەبا، حەق و راستی بلّێن و بەزەییتان بە بێباوکەکاندا بێتەوە و دژی ستەمکاران بوەستن و پشتی ستەم لێکراو بگرن و قسەوقسەلۆکی خەلّکی لە تێکۆشان و کاری چاکە ساردتان نەکاتەوە). دوای ئەوەی وەفاتی کرد حسن و حسین و عبدالله ی کوڕی (جعفر) شۆردیان و (حسن) ی کوڕی نوێژی لەسەر کردو پاشان لەبەرەبەیاندا بردیان بۆ ناشتن.لەبارەی شوێنی ناشتنەکەیەوە قسەی زۆر کراوە، هەندێك دەلّێن لەلای روگەی مزگەوتی کوفەوە نێژراوە، هەندێك دەلّێن لای کۆشکی خەلافەت نێژراوە و هەندێکیش دەلّێن لە نەجەف نێژراوە، زۆرینەی زاناکان لەگەلّ ئەوەدان کە شوێنی ناشتنەکەی دیار نیەو بزریان کردووە ئەویش لە ترس خەوارجەکان.

> ئەو کەسەی شەوی حەڤدەیەمی مانگی رەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، نامرێ و لە دونیا دەرناچێ هەتا شوێنی خۆی لە بەهەشتدا نەبینێ...
>
> (پێشەوا علی)



دوعای ڕۆژی هەژدەیەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم نبهني فيه (في رمضان) لبركات اسحاره، ونور قلبي بضياء انواره وخذ بكل اعضائي الى اتباع اثاره بنورك يا منور قلوب العارفين.**



**ی ڕەمەزان**

* خالیدی کوڕی وەلید وەفات دەکات:
لە (١٨) ڕەمەزانی ساڵی (٢١ك) بەرامبەر (٢٠)ی ئابی ساڵی (٦٤٢ ز) تێکۆشەری ناوداری ناو هاوەڵان خالیدی کوڕی وەلید ی ناسراو بە (سيف الله المسلول) وەفاتی کرد.

* پێشەوا (حسين ی کوری علی) دوای شەهید بوونی باوکی دەکرێتە خەلیفە:
لە (١٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٠ ك) بەرامبەر (٢٤)ی کانونی دووەمی ساڵی (٦٦١ ز) بەیعەتی خەلافەت درا بە (حسين ی کوری علی) ڕەزای خوایان لێ بێ، ئەمەش دوای شەهید بونی باوکی.

* ڕێکخستنەوەی ریزی موسڵمانەکان:
لە(١٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٨٤ ك) بەرامبەریە ساڵی (١٠٩١ ز) سەرکردە (يوسفی کوڕی تاشفين) توانی هێزو توانای موسڵمانەکان یەك بخات و زاڵ بێت بەسەر پەرتەوازەیی نێوانیاندا لە ئەندەلوس.

* دەسەڵاتی مرابتەکان لە مەغریب کۆتایی هات:
لە (١٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٣٩ ك) کۆتایی دەوڵەتی (مرابطين) بوو لە وڵاتی (مەغرب) دا، لە جێگەی دا دەوڵەتی (موحدين) دروست بوو، لە کاتێکدا کێشەو ململانێی نێوان مرابتین  بە سەرۆکایەتی (تاشفين ی کوڕی علی کوڕی





یوسفی کوڕی تاشفین) و (موحدین)ەکان بە سەرۆکایەتی(عبدالمؤمن ی کوڕی علی) گەرم بوو، پاشان شەڕێکی توند لە نێوان سوپای هەردوو لادا ڕوویدا و تێیدا (تاشفین) کوژرا دوای ئەوەی لەسەر بەردێك کەوتە خوارەوە و(موحدین)ەکانیش سەریان بڕی و بردیانەوە بۆ (تینمل) کە مەڵبەندی بانگەوازی (موحد)ەکان بوو، ئەم روداوەش بووە مایەی کۆتایی هێنان بە دەوڵەتی مرابتەکان لە مەغریب دا، هەرچەندە هەوڵیاندا دووبارە لە ڕێگەی (اسحاقی) برای (تاشفین)ەوە هەڵسنەوە بەڵام نەیانتوانی.

* عبداللە ی کوڕی موبارەك وەفاتی کرد:

لە (١٨)ی مانگی رەمەزانی ساڵی (١٨١ ك) پێشەوا عبداللە ی کوڕی موبارەك کۆچی دوایی کرد.

* دانەری یەکەم کتێبی فەرموودە کۆچی دوایی کرد:

لە (١٨)ی مانگی رەمەزانی ساڵی (١٢٤ك) پێشەوای فەرموودە ناس (محمدی کوڕی شیهاب ی زوهری) کۆچی دوایی کرد. شایانی باسە ئەم زانا بەڕێزە یەکەم کەس بووە کە کتێبی لە بواری فەرموودەدا داناوە.

* توندوتیژی نێوان هیندۆسەکان و موسڵمانەکان:

لە (١٨)ی رەمەزانی ساڵی (١٣٦٥ ك) بەرامبەر(١٦)ی ئابی ساڵی(١٩٤٦ ز) ، کارە توندو تیژیەکان لە نیوان هیندۆسە توند رەوەکان لەلایەك و موسڵمانەکان لەلایەك لە شاری (کالکوتا)ی (هندی) سەری هەڵدا و لە وێشەوە شەڕەکە تەشەنەی کرد تا زۆرێك لەشارەکانی تریشی گرتەوە و بۆماوەی سێ رۆژ ئەو توندو تیژیانە بەردەوام بوو لە ئاکامدا ٧ هەزار کەس کوژران.







*** شەڕی ناوخۆ سەر هەڵدەدات:**

**لە (١٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٩٣ز) – شەڕی ناوخۆ لە وڵاتی (تاجیکستان) درووست بوو، تاجیکستان وڵاتێکی ئیسلامی بوو لە ناوەڕاستی ئاسیادا کە دەوڵەتی روسی قەیسەری لە ناوەڕاستەکانی سەدەی ١٩ داگیری کردبوو و ئەوان حوکمی ئەو وڵاتەیان دەکرد، دوای یەکێتی سۆڤیەتی ئیشتراکی ، لەژێر ئەو دەستەڵاتەدا فیکرەی شیوعیەت پەرەی سەند و هاووڵاتیانی ئەو وڵاتە دەیان ناڵاند بە دەست حوکمی تاك رەوی و سیاسەتی پاکتاوی ئاینی و سڕینەوەی دینداری، ئەوەبوو دوای لێك هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت تاجیکستان نیمچە سەربەخۆیی یەکی وەرگرت، بەڵام شیوعیەکان دەسەڵاتیان هەر بەدەستەوە بوو، لەوکاتەدا ژمارەیەك لە چەکدارەکان ویستیان بەفەرمی ئیعلانی دەوڵەتێکی ئیسلامی بکەن، ئەم حاڵەتە بووە هۆکاری درووست بوونی دووبەرەکی لە نێوان موسڵمانەکان و شیوعیەکان بەشێوەیەك کە شەڕێکی خوێناوی لێکەوتەوە و دەیەها کەسی تێدا کوژرا و بە سەدەهای تریش ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشت و ئاوارە بوون.**

ئەو کەسەی شەوی هەژدەیەمی مانگی ڕەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، وەکو ئەوکەسە وایە کە خوای گەورە لەخەم و خەفەتی دونیا و دوارۆژ پاراستویەتی...
(پێشەوا علی)




دوعای ڕۆژی نۆزدەیەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم وفر فيه (لي رمضان) حظي من بركاته، وسهل سبيلي الى خيراته، ولا تحرمني قبول حسناته يا هاديا الى الحق المبين.**



ی

ڕەمەزان

* شەڕی دەریایی:

لە (١٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (١١٢١ ك) بەرامبەر (٣٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٨٠٦ ز) شەڕێکی دەریایی لە نێوان کەشتی عەممانیەکان و کەشتی پرتوگالیەکان دا ڕویدا و لە ئەنجامدا کەشتی عەممانیەکان پاشەکشەیان کرد و گەڕانەوە بۆ (رأس الخيمه).



* دامەزراندنی زانکۆی زەیتونە:

لە (١٩)ڕەمەزانی ساڵی (١٣٧٥ ك) بەرامبەربە (٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٥٦ ز) حکومەتی تونس بڕیارێکی دەرکرد و تیایدا بە فەرمی داوای کرد مزگەوتی (زەیتونە) تایبەت بکرێت بە زانست و فێربونی زانستە جۆراوجۆرەکـان و ناوەکەشـی لـە مزگـــەوتی زەیتونەوە بگۆڕیَ بــۆ زانکـــۆی



زەیتونە، پاشان (٥) کۆلێژی جیاجیای تێدا کرایەوە.

* دەرگای بارەکان دادەخات و ڕیَ لە خراپەکاری دەگرێت:

لە ١٩ ڕەمەزان دا (ایوب ی کوڕی شرحبیا) ئەمیرو والی میسر وەفاتی کـرد، لەسەردەمی (عمری کوڕی عبدالعزیز) دا ئەم پیاوە گرنگیەکی یەکجار زۆری بە چاکسازی میسر دەدا لە هەموو بوارەکاندا، فەرمانی بە چاکە دەکرد و ڕێگری لە خراپە دەکرد و دەرگای بار و شوێنی عارەق خواردن و فرۆشتنی داخستبوو و لەناو خەڵکدا کەسایەتیەکی بەرزی هەبوو بەکەسێکی لەخواترس و بۆخوا ژیاو و ڕاستگۆ دەناسرا.

* شاری (قدس) بەزۆر دەکریَ بە پایتەختی جولەکە:

لە ١٩ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٠٠ک) بەرامبەر (٣١)ی تەموزی ساڵی (١٩٨٠ز) – (کیست)ی جولەکەی زایۆنی یاسایەکی دەرکرد کە تێیدا شاری (قدس)ی بەپایتەختی دەسەڵاتی جولەکە ناساند.



ئەو کەسەی شەوی نۆزەیەمی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، مەلائیکەی خوای گەورە هەموو ڕۆژێك دەچنە ماڵەکەی و سەردانی دەکەن...

(پێشەوا علی)

دوعای رۆژی بیستەمی مانگی رەمەزان:

اللهم افتح لي فيه (في رمضان) ابواب الجنان، واغلق علي فيه ابواب النيران، و وفقني فيه لتلاوة القران يا منزل السكينة في قلوب المؤمنين.



ی
رەمەزان

*دروست کردنی مزگەوتی قەیرەوان:

لە (٢٠) رەمەزانی ساڵی (٥١ ك)



بەرامبەر بە(٢٩)ی ئەیلولی ساڵی(٦٧١ ز) مزگەوتی قەیرەوان لە سەردەستی عەقبەی کوڕی نافع دروست کرا، (رەزای خوای لێ بێ).

* خەڵکی راپەڕین درووست دەکەن:

لە (٢٠)رەمەزانی ساڵی (٢٠٢ ك) بەرامبەر (٣٠)ی ئازاری ساڵی (٨١٨ ز) ، بە هەزاران کەس لە خەڵکی شاری قرتبەی ئەندەلوس ئاوارە بوون و ماڵ و حاڵی خۆیان جێهێشت، دوای ئەوەی کە لە راپەڕینە جەماوەریەکەیان سەرکەوتو نەبوون و شکستیان هێنا لە دژی دەسەلاَتی (حکم ی کوڕی هیشام)، ئەوە بوو (حکم) بە توندترین شێوە روبەڕوی خەڵکی راپەڕیو بووەوە و خانووەکانیانی روخاند و لە ماڵ و حاڵی خۆیان و لە ئەندەلوس دەری کردن و زیاتر لە (١٥) هەزار کەسیان رویان کردە ولاَتی میسر پاشان لەوێشەوە کۆچیان کرد بۆ





دورگەی (اقريطس كريت) لە ساڵی (٢١٢ ك) لەوێ دەوڵەتێكی بچوكيان پێك هێنا و ماوەی سەدەو نیوێك بەردەوام بوو.

* جارێكی تریش دەوڵەتی عوسمانی شكست دەخوات:

لە (٢٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٠٩٤ ك) بەرامبەریە (١٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٦٧٣ ز) سەرەتای وەستانی هەوڵەكانی دەوڵەتی عوسمانی بوو لەو كاتەی بەردەوام و قۆناغ بەقۆناغ ناوچەكانی ئەوروپایان فەتح دەكرد، بەڵام لەناكاو شتێكی چاوەڕوان نەكراو هاتە پێش ئەویش شكست خواردنی دەوڵەتی عوسمانی بوو لە بەرامبەر دیواری چواردەورە (اسوارە) كانی (فینا) دا كەقۆناغێكی تازەی لە مێژوی عوسمانیەكاندا دروست كرد، چونكە (فینا) قۆناغی كۆتایی ئەوروپا بوو كە عوسمانیەكان پێی گەیشتن، عوسمانیەكان دوو جار گەمارۆی (فینا) یان دابوو بەڵام هەردوو جارەكە شكستیان هێنا، یەكەمیان لە سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانونی و دووهەمیان لە سەردەمی سوڵتان (محمدی چوارەم) دا. بەڵام هەركام لەو هەوڵانە بێئاكام بوون، یەكەمیان بەهۆی كەمی پێداویستی و هاتنی سەرماو سۆڵەی زستان و دوهەمیشیان بەهۆی هەندێك خیانەتی ناو سوپاوە بوو، ئەوە بوو ئەوروپا ئەم شكستەی عوسمانیەكانی بە هەل زانی و هەوڵی دا هاوپەیمانیەك دژی عوسمانیەكان دروست بكات.

* (شهاب الدين البكري) وەفات دەكات:

لە ٢٠ی ڕەمەزان ڕێكەوتی ڕۆژی هەینی ٤ی حوزەیرانی ساڵی (١٣٣٣ز) (شهاب الدين ابو العباس احمدی كوڕی عبد الوهاب ی البكري) وەفاتی كرد. ئەم زانا بەڕێزە بە چەند پشتێك دەچێتەوە سەر پێشەوا (ابوبكری صدیق) و یەكێك بووە لە زانا ماندونەناسەكان و توانیویەتی مێژویەك بۆخۆی تۆمار





بکات، هەشت جار (صحیحی بوخاری) بەدەست نوسیوەتەوە و کتێبێکی مێژویی تریشی هەیە بەناوی (منتهى الارب في علم الادب) کە (٣٠) بجلدە و کتێبێکی کەم وێنەی سەردەمی خۆی بووە.

* لە (٢٠)ی مانگی ڕەمەزاندا پێغەمبەر (ﷺ) بە خۆی و (١٠) هەزار هاوەڵی چەکدارەوە چووە ناو شاری مەککە و ئەوشارەی لە بت پەرستان پاك کردەوە.

ئەو کەسەی شەوی بیستی مانگی ڕەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، نامرێ تا پێغەمبەر (ﷺ) لە خەودا نەبینێ و مژدەی بەهەشتی پێنەدا...

(پێشەوا علی)

ئایا مرۆڤ لە جیهاندا ئەوەندە هۆشیارە کە لە ئەزمونی کەسانی تر پەند وەربگرێت.

(وتە)



دوعای رۆژی بیست و یەکەمی مانگی رەمەزان:

**اللهم اجعل لي فيه (في رمضان) الى مرضاتك دليلا، ولاتجعل للشيطان فيه سبيلا، واجعل الجنة لي منزلا ومقيلا، يا قاضي حوائج الطالبين.**



**ی رەمەزان**

* پێغەمبەر(ﷺ) گوێزەبانە(العقيقة) بۆ (حسن) دەکات:

لە(٢١)ی رەمەزانی ٦ی مانگی ئایاری ساڵی (٦٥٢ ز) پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێزەبانە (عقیقە) ی بۆ (حسن) ی کوڕی پێشەوا علی کرد دوای ئەوەی کە (٧) رۆژ بەسەر لەدایك بونەکەیدا تێپەری کردبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەیوانێکی بەوبۆنەیەوە سەربڕی و پاشان سەری (حسن) ی تاشی و فەرموی بڕۆن موی سەری بکێشن بە زیوو و پاشان زیوەکە بکەن بەخێر.

* بەهۆی خواردنی ماستی گامێشەوە دەمرێت:

لە (٢١) مانگی رەمەزان دا خەلیفە (المعتز بدين الله) بوویە (والی) وڵاتی میسر، توانی لەماوەی دەسەڵاتی خۆی دا گەورەترین خزمەت بە خەڵکی میسر بکات و لەپارەی (بيت المال) هاوکاری و دەست گیرۆیی دەکردن و بە درێژایی مانگی رەمەزان (سفرە)ی رادەخست و خوانی بۆ خەڵکی ئامادە دەکردو دەعوەتی دەکردن بۆ رۆژو شکاندن (الافطار).

مانگانە لەماڵی خۆی بری ١٠٠٠ دیناری ئەوکاتەی دەبەخشی، هەرلەسەر حسابی خۆی مزگەوتێکی دروست کرد بڕی زیاتر لە ١٢٠ هەزار دیناری تێچوو. خەلیفە (معتز) ٣٣ منداڵی هەبوو ١٧ کوڕو ١٦ کچ ، ئەوە بوو بەهۆی خواردنی ماستی گامێش وەفاتی کرد لەمیسر، لەدوای خۆی کوڕەکەی (خمارويه) دەسەڵاتی میسری گرتە دەست.




* حەزرەتی عیسی (ﷺ) بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان:

لە (٢١)ی مانگی ڕەمەزاندا حەزرەتی عیسی پێغەمبەر(ﷺ) لە لایەن خوای گەورەوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان.

* حەزرەتی (موسی) پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد.

لە (٢١)ی مانگی ڕەمەزاندا حەزرەتی (موسی) پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد. (حورەیث ی کوڕی مەخشی) بەرەحمەت بێ دەڵێ: گوێم لە حسن ی کوڕی علی بوو وتاری بۆ خەڵکی دەداو باسی لێهاتووی باوکی دەکرد و دەیفەرمو: باوکم لەوشەوەدا شەهیدکرا کە قورئانی تێدا دابەزی و حەزرەتی (عیسی) پێغەمبەری تێدا بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانەکان و حەزرەتی( موسی) پێغەمبەر تێیدا وەفاتی کرد.[1]

* هەڵبژاردنی (محمد) (ﷺ) بۆ پێغەمبەرایەتی.



---

[1] خبر حسن ، اخرجه الحاكم ١٤٣/٣ ، وصححه و سكت عنه الذهبي.

لە (٢١)ی ڕەمەزانی (١٠)ی ئابی ساڵی (٦١٠ز) خوای گەورە (محمد)ی هەڵبژاردو کردی بە پێغەمبەر، لەو کاتەی کە لە ئەشکەوتی (حراء) خەریکی بەندایەتی کردنی خوا و بیر کردنەوە لە دەسەڵاتی پەروەردگاری بوو، ئەوەبوو بۆ یەکەم جار خوای گەورە (جبرئیل)ی ئەمینی نارد بۆ لای و مژدەی بوون بە پێغەمبەری بە ئاشکرا پێداو یەکەم زنجیرەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی دابەزاندە سەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ) کە بریتی بوو لە سەرەتای سورەتی (العلق) (اقرأ بأسم ربك الذی خلق خلق الانسان من علق .........................علم الانسان مالم یعلم)

ئەو کەسەی شەوی بیست و یەکی مانگی ڕەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، پاداشتی وەکو ئەوکەسە وایە کە خواردنی شەست فەقیری داوەو جل و بەرگیشی بۆکردون و پۆشتەی کردونەتەوە...

(پێشەوا علی)

تەجروبە گەورەترین وانەی ژیانە، بەڵام بەداخەوە بۆ بەدەست هێنانی بەهای گرانی دەوێ.

(وتە)









**دوعای رۆژی بیست و دووەمی مانگی رەمەزان:**

**اللهم افتح لي فيه (في رمضان) ابواب فضلك، وانزل علي فيه بركاتك، و وفقني فيه لموجبات مرضاتك، واسكني فيه بحبوحات جنانك، يا مجيب دعوة المضطرين.**



**ی رەمەزان**

*** وەفات کردنی زانای ناودار (ابن ماجە) :**

**لە (٢٢)ی رەمەزانی ساڵی(٢٧٣ ك) بەرامبەربە (٢٠)ی شوباتی ساڵی (٨٨٦ ز) پێشەوا محمدی کوڕی زەیدی کوڕی ماجەی قەزوینی، خاوەنی (سنن ابن ماجە) کە یەکێکە لە کتێبەکانی (الصحاح الستە) وەفاتی کرد.**

*** ناسناوی (امیر المؤمنین) وەردەگرێت:**

**لە (٢٢)ی رەمەزانی ساڵی (٢٧٧ ك) بەرامبەربە (٧)ی کانونی دووەمی ساڵی (٨٩١ ز) (عبدالرحمن الناصر) هەشتەمین دەستەڵات دارو بڕیار بەدەستی ئەندەلوس لە کوڕانی ئومەیە لەدایك بوو، کە یەکەم کەس بوو ناوی لێ نرا (امیر المؤ منین) و ناسناوی (الخلافە) ی وەرگرت، سەردەمی ئەویش باشترین سەردەمەکانی ئەندەلوس بوو لە رووی دەستەڵات و شارستانیەت دا.**




* هەڵکەندنی خەندەق لە میسر:

لە (٢٢)ی رەمەزانی ساڵی (١٢٧٥ ك) بەرامبەریە (٢٥)ی نیسانی ساڵی (١٨٥٩ ز) سەرەتای دەست پێکردنی لێدان و هەڵکەندنی خەندەقی کەناڵی (السویس) بوو لە میسر.



ئەو کەسەی شەوی بیست و دووی مانگی رەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، پاداشتی وەکو کەسێك وایە کە لە گەرمایەکی زۆر گەرمی نیوەڕۆدا ئاوی ساردی بە کەسانی تینو دابێت...

(پێشەوا علی)



دوعای رۆژی بیست و سێیەمی مانگی رەمەزان:

**اللهم اغسلني فيه (في رمضان) من الذنوب، وطهرني فيه من العيوب، وامتحن قلبي فيه بتقوى القلوب، يا مقيل عثرات المذنبين.**



**ی رەمەزان**

*** بتی (الات) دەشکێندرێت:**

لە (٢٣)ی رەمەزانی سالّی (٩ ك) بەرامبەربە سالّی(٦٣١ ز) کۆتایی بە روخان و تێکشکاندنی بتی (الات) هات.

*** دەسەلاّتی فارسەکان کۆتایی دێت:**

لە (٢٣)ی رەمەزانی سالّی (٣١ ك) بەرامبەربە سالّی (٦٥٢ ز) لەسەردەمی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفان دا موسلّمانان توانیان سەربکەون بەسەر ساسانیەکاندا دوای ئەوەی کە سەرکردەکەیان (یزدجرد) ی کوڕی شهریار کوژرا، بەوەش کۆتایی بە دەستەلاّت و دەولّەتی فارسەکان هات.

*** پێشەوا (ابوالحسن الندوی) کۆچی دوایی دەکات:**

لە (٢٣)ی مانگی رەمەزانی سالّی (١٩٩٩ز) زانای ناوداری ئیسلامی (ابوالحسن الندوی) وەفاتی کرد، ئەم زانا بەرێزە ناوی تەواوی (علی کوڕی فخرالدین حسن)ی یەو لە رۆژی (٦/ محرم/١٣٣٣ ك) بەرامبەربە سالّی (١٩١٤ز) لە گوندی (تەکیە کلان) لە ویلایەتی (تەترابردیش) لە بنەمالّەیەکی ناودار لەدایك بووە، باوکی یەکێك بووە لە زانا ناودارەکانی هندستان و چەندین کتێب و دانراوی گرنگی هەیە، دایکیشی بە هەمان شێوە جگەلەوەی هەموو




قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە لە هـەمان کاتـدا جگـە لـە شـیعر نووسـین چـەند نامیلکە یەکیشی بلاو کردۆتەوە، پێشەوا (النـدوی) چـەندین شـوێن و ... گەڕاوە بەدوای خوێندنی زانستە جۆراو جۆرەکاندا تا دواجار لە ساڵی (...) (ئیجازەی فەرمودەی پیرۆز) وەردەگرێت لە لایەن فەرمودەناس ی ناودار (شیخ حیدر حسن خان)، پاشان لە سـاڵی (١٩٤٣ز) سـەنتەرێك دەكاتـەوە لـەبواری زانـستی ئیـسلامیدا، لـە سـاڵی (١٩٥١ز) بزوتنـەوەی پـەیامی مرۆڤایـەتی دادەمەزرێنێت (الرسالە الإنسانیە)، لە ساڵی (١٩٥٩ز) كۆمەڵگـەی زانـستی (لكهنو) دادەمەزرێنێت، لەساڵی (١٩٦١ز) دەبێتە سكرتێری نەدوەی زانایان. تـا ئـەوەبوو لـە (١٩٩٩/٣/١٦ز) توشـی جەڵتـە دەبێـت و دوای ماوەیەك تەندروستی باش دەبێتەوە، مامۆستا (الندوی) عادەتی خۆی وابوو لە مـانگی رەمەزان دا دەچوویەوە گوندەكەی خۆیان و لەوێ دەمایـەوە، بـەڵام ئـەمجارەیان لەبەرئەوەی تەندروستی باش نەبوو بزیشكەكان داوایان كەدەبێ لەژێر چاودێری ئەواندا بمێنێتەوە، ئەو داوای كرد كە تەنها دە رۆژی كۆتایی مـانگی رەمـەزان رێگەی بدەن كە بچێتەوە گوندەكەیان (تەكیەی گەیلان)، ئـەوەبوو لـە (٢٠)ی مانگی رەمەزان بەرامبەر بە (١٩٩٩/١٢/٢٩)ز) لەگەڵ هەنـدێ لـە كـەس و كاری و چەند دۆستێكی و پزیشكەكانی دا رۆشتەوە گوند، بەڵام دوای سێ رۆژ لە چوونەوەی لە (١٩٩٩/١٢/٣١ز) و لـە رۆژی هـەینی (٢٣)ی رەمەزاندا و لەوكاتەی كە دەیویست خـۆی بـۆ نوێـژی هـەینی ئامـادە بكـات و سورەتی (الكهف) بخوێنێت بەڵام ئەمجارەیان سورەتی (یس) خوێندو دوای خوێندنی ...

ئایەتێك لە سورەتی(یس) کۆچی دوایی دەکات و لە هەردوو مزگەوتی (الحرام)و مزگەوتی (مدینە) نوێژی غائیبی لەسەر دەکرێت. اناللە وانا الیە راجعون.[1]

* دەوڵەتی (طولون) درووست دەکات:

لە (٢٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٢٠ ك) بەرامبەر (٢٠)ی مانگی ئەیلولی ساڵی (٨٣٥ ز) (احمدی کوری طولون) دروستکەری دەوڵەتی (طولون) یەکان لە بەغدا لە دایك بوو، هەرلە شاری بەغدا زانستە سەربازی و دینیەکانی خوێندوو، پاشان لەبەر لێهاتویی توانی دەسەلاّتی میسر بگرێتە دەست لە ساڵی (٢٥٤ ك) بەرامبەربە(٨٦٨ ز)، پاشان توانی بە هەوڵو تێکۆشانی خۆی دەوڵەتێکی گەورە و بەهێز دابمەزرێنێت کە هەر یەك لە میسر و شام و حیجاز لە خۆ بگرێت، ئێستاش مزگەوتی گەورەی قاهیرە گەواهی دەری لێهاتویی ئەو و پێشکەوتویی دەوڵەتەکەیەتی.

* دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (الاخبار):

لە(٢٣)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٧١ ك) بەرامبەر (١٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٥٢ز) ژمارە (١)ی ڕۆژنامەی (الاخبار) کە لەلایەن برایان (علي و مصطفی امین) دانرا و ئێستاش بەردەوامە لە دەرچوون و بەناوی (الاخبار الیوم)ە وە دەردەچێت.

* بۆیەکەم جار ئەنجامدانی نوێژی (تەراویح):

لە ٢٣ ڕەمەزاندا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خۆی و هاوەڵانەوە چونە مزگەوت و لە شەوا بۆ یەکەم جار نوێژی تەراویحیان لە مزگەوت و بەجەماعەت ئەنجام دا،

---

[1] سەرچاوە – ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژ(٨٠٧)ی ٢٠١٠/٩/١٦ز





**پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەشت ڕکعاتی لە مزگەوت پێدەکردن و ئەوەی تریان لەماڵەوە و هەریەکەیان خۆیان دەیانکرد، بۆ ماوەی سێ شەو بەردەوام بوون پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی نوێژی تەراویح هەریەکەتان بۆخۆی لەماڵەوە بیکات، هۆکاری ئەم بڕیارە ئەوە بوو کە هاوەڵان ئەوەندە گەرم و گوڕ بوون لەسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوە ترسا کە خوای گەورە لەسەریان واجب بکات بۆیە وەکو بەزەیی یەک بەموسڵمانانی ئومەتەکەی ئەو بڕیارەی دا، پاشان لە سەردەمی پێشەوا عمری کوڕی خەتاب دا نوێژی تەراویح هێنرایەوە مزگەوت.**

*** وەفات کردنی شاعیری ناودار ئوسامەی منقز:**

**لە ٢٣ ڕەمەزان دا (ئوسامەی کوڕی مرشیدی کوڕی علی کوڕی مقلدی کوڕی نصری کوڕی منقز) شاعیرو سەرکردەی موسڵمانان وەفاتی کرد، ئەم قارەمانە لە شەڕی دژی خاچ پەرستەکاندا گەورەترین سەرکەوتنی تۆمار کرد جگە لەوەش لەبواری نوسینیش دا دەستێکی باڵای هەبووە و جگە لەدیوانە شیعرەکەی کە لە ژێر ناوی (الاعتبار)دا چاپی کردووە لە بواری ئەدەبیش دا چەند کتێبێکی هەیە.**

ئەو کەسەی شەوی بیست و سێی مانگی ڕەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە،پاداشتی لای خوای گەورە وەکو ئەوکەسە وایە کە گیراو و بەندکراوانی ئومەتی محمد (ﷺ)ی بە پارەی خۆی کڕیوەتەوە و ئازادی کردوون...

(پێشەوا علی)







**دوعای ڕۆژی بیست و چوارەمی مانگی ڕەمەزان:**

**اللهم اسألك فيه (في رمضان) ما يرضيك، واعوذ بك مما يؤذيك، و اسألك التوفيق فيه لأن اطيعك ولا اعصيك، يا جواد السائلين.**



**ی ڕەمەزان**

* **تەواو بوونی مزگەوتی (عمری کوڕی عاص):**

لە (٢٤) ڕەمەزانی ساڵی (٢٠ ك) بەرامبەر (٥)ی ئەیلولی ساڵی (٦٤١ ز) مزگەوتی (عمری کوری عاص) (رضي الله عنه)



تەواو بوو کە لە (فسطاط)ە.

* **(یابان) خۆی تەسلیم بە ئەمریکا دەکات:**

لە (٢٤)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٦٤ ك) بەرامبەر (٢)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٤٥ ز) وەزیری دەرەوەی یابان بە ڕەسمی داوای خۆبەدەستەوەدانی وڵاتەکەی گەیاندە دەستی جەنەراڵ مارك ئارسەر، ئەمەش دوای ئەوە هات کە ئەمریکا دوو





قومبەلەی زەڕڕەی لە هەردوو شاری هێرۆشیما و ناکازاکی دا، کە هەردوو شارەکەی بەتەواوی وێران و خاپور کرد و زیاتر لە (١٤٠) هەزار کەس لەو شارەدا کوژران و نزیکەی (٧٠) هەزار کەسیش بریندار بوون.

* ناردنەدەرەوەی پترۆڵ ڕادەگرن:

لە (٢٤)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٩٣ ك) بەرامبەر (٢١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٣ ز) هەریەك لە وڵاتەکانی کوێت و قەتەر و بەحرێن و دوبەی بڕیاریان دا بەیەکجاری ناردنی (پترۆڵ) ڕابگرن و نەینێرن بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هۆڵەندا، ئەمەش وەك هاوسۆزیەك بەرامبەر بە میسر و سوریا لەو شەڕەیاندا کە لەگەڵ جولەکەی داگیرکەر دا بەرپایان کردبوو، ئەوە بوو توانیان بە بەکارهێنانی چەکی نەوت بۆیەکەم جار سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنن.

* ڕاوچی دەبابە:

لە (٢٤) ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٢ ك) بەرامبەر (٩)ی کانونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠١ ز) (محمد عبدالعاطی) ناسراو بە ڕاوچی دەبابە وەفاتی کرد. لە شەڕی ئۆکتۆبەری (١٩٧٣ز) ناسناوی (ڕاوچی دەبابە) یان دەبابە شکێنی وەرگرت، ئەوەبوو ناوی لەناو فەرهەنگی شەڕەکاندا وەکو ناسراوترین ڕاوچی دەبابە دانرا لە جیهاندا.

* بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات:

لە ٢٤ی ڕەمەزاندا شاعیری ناودار (احمدی کوری حسین ی کوری حسن ی کوری عبدالصمد الجعفی الکندی الکوفی) کوژرا، ناوبراو لە کوفە لەدایك بووە و ناسناوی (ابوطیب المتنبی) وەرگرتووە، بۆیە پێی وتراوە (المتنبی) چونکە لە دەشتی سەماوە دا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد و دەیگوت من

پێغەمبەرم، توانی خەڵکێکی زۆر لەخۆی کۆبکاتەوە، کاتێك ئەم دەنگوباسە گەیشتەوە بە (لؤلؤ)ی ئەمیری (حمص) تورەبوو و بە خۆی و هێزێکەوە هاتوو توانی (متنبی) دەست گیربکات و خەڵکەکەی دەوریشی بڵاوە پێ بکات، پاشان (متنبی) لە بەندینخانەدا تۆبەی کردو پەشیمان بویەوە، ئەوەبوو ئازاد کراو دوبارە دەستی بەکارەکەی کردەوە و ئەمجارەیان بە گورو تینێکی باشتر بە شێوەیەك کە هەندێك دەستەواژەی رێك خستبو کە گوایە ئایەتی قورئانە و بۆی دابەزیوە و بەسەر خەڵکا دەیخوێندەوە بۆنمونە دەیگوت ( والنجم والسیار، والفلك الدوار، والليل والنهار، ان الكافر لفي اخطار، امض على سنتك، واقف اثر من كان قبلك من المرسلين، فان الله قامع بك زيغ من (أُلحد) في الدين وضل عن السبيل) ئەمانە و چەندین قسەی تری دەکرد بەناوی ئایەتەوە ئەوە بوو دواجار (عضد الدولة) هێزێکی بە سەرۆکایەتی (فاتك بن ابي جهل الاسري) نارد بۆ لەناوبردنی (متنبی) و دارودەستەکەی هێزەکە لەدەوروبەری (نوعمانیە) پێی گەیشتن و دوای شەڕێکی کەم خایەن (متنبی) تێدا کوژرا.

ئەو کەسەی شەوی بیست و چواری مانگی رەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، خوای گەورە لە رۆژی قیامەت نامەی کردەوەکانی بەدەستی راستی دەداتەوە دەستی...

(پێشەوا علی)

لە هەموو شتەکاندا سەرکەوتن بەندە بە ئامادەکاری پێش وەختە، بەبێ ئەمە بێ گومان شکست لە رێدایە.

(وتە)

دوعای ڕۆژی بیست و پێنجەمی مانگی ڕەمەزان:

اللهم اجعلني فيه (في رمضان) محبا لأوليائك، و معاديا لأعدائك، متسناً بسنة خاتم انبيائك، يا عاصم قلوب النبيين.



ی

ڕەمەزان

* بتەکان دەشکێنن:

لە ٢٥ ڕەمەزانی ساڵی (٨ ك) بەرامبەر (١٥)ی کانونی دووەمی ساڵی (٦٣٠ ز) پێغەمبەری پێشەوامان محمد (ﷺ) خالیدی کوری وەلیدی نارد بۆ تێکشکاندنی بتی(العزى) وە (عمروی کوڕی عاص) ی نارد بۆ روخاندنی بتی(سواع)، وە سعدی کوڕی زەیدی نارد بۆ شکاندنی بتی(مەنات)، هەریەکە لەو هاوڵانە بەسەرکەوتویی کاری خۆیان ئەنجام دا و گەڕانەوە.

* سوپای موسڵمانان سەردەکەوێ:

لە (٢٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٦٣ ك) بەرامبەریە (١٠٧٠ ز) موجاهید و تێکۆشەری ئیسلامی (ألب ارسلان) سەرۆکی سوپای موسڵمانان و سوڵتانی دەوڵەتی سەلجوقیەکان توانی سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بێنێ لە مێژوی ئیسلامیدا بەسەر دەوڵەتی بیزەنتیەکان و هاوپەیمانە خاچ پەرستەکانیاندا، شایانی وتنە هەرلەو شەڕەدا ئیمپراتۆری بیزەنتیەکان (روماس)ی چوارەم بەدیل گیرا.




* لە ٢٥ی ڕەمەزان دا (بدیع الزمان) شێخ سعید نورسی وەفاتی کرد:



(بدیع الزمان، مامۆستا شێخ سەعیدی نورسی) کە لە ساڵی (١٢٩٣ك) بەرامبەر بەسانە ساڵی (١٨٧٣ز)[1] لە دێی (نەورسی)[2] لە قەزای (هیزان) لە ناوچەی (بەدلیس) لە کوردستانی تورکیا لە دایك بووە لە دایك و باوکێکی کورد.

لە تەمەنی نۆ ساڵیدا دەستی کردووە بە خوێندن لای ( مەلا عبدالله)ی کاکی، لە پاشا کە چاوی ئەکرێتەوە ئینجا ئەگەڕێت بە شوێن مامۆستای بەرزو باڵادا، لەم مزگەوت بۆ ئەو مزگەوت و لەم دێ بۆ

---

[1] لێکۆڵینەوە تازەکان جەخت لەسەر ئەم مێژووەی خوارەوە دەکەن بۆ لەدایك بوون مامۆستا نوورسی: (١٢٩٤ك بەرامبەر ١٨٧٦ز) بڕوانە (سیرة ذاتیة، بدیع الزمان سعید النورسي)ص ١٣ ط ١. استانبول ١٩٩٨م. گەڵێ سەچاوەی تریش.

[2] لە کوردستانی باشووری خوماندا- بەداخەوە- ناوی گوندەکەی نوورسی بە هەڵە لای هەندێك کەس بە (نەورەس) یان(نەورەسی) بڵاو بووەتەوە، مامۆستای خاڵیش بەو پێ یە ناوی گوندەکەو نازناوی بەدیعوززەمانی نووسیوە، لە کاتێکدا لێکۆڵینەوە لەم بابەتە کارێکی دژوار نی یە، لێرەدا بۆ خوێنەری بەڕێز روون دەکەمەوە کە گوندیەکەی ناوی(نوورس)ە، کە بە پیتی لاتینی بەم جۆرە دەنوسرێت (Nurs) بە خۆیشی دەڵێن: (Nursi) ئەمە راستی یەکی یەکجار رووتە.

ئەودیّ و لەم شار بۆ ئەوشار، لەم زانستگا بۆ ئــەو زانــستگا. وە لــە تەمــەنی هەژدە سالّی دا پایەی زانایی بە جۆرێك بەرز ئەبێتــەوە، لەهــەموو لایەکــەوە پەنجەی بۆ ڕائەکێشن، وە لە هەموو شوێنێك باسی دەکەن، تا ناوبانگ دەرئەکا بە مەلا سەعیدی مەشهوور. مەلا سەعید تواناى لەبەرکردنی ئەوەنــدە بــەهێز بووە، هەرچێکی بەرچاو کەوتبیّ هاتۆتە بــەری، تەنانــەت نیــوەی مــەقاماتی حەریری[٣] و، قاموسی فەیروزابادی تا پیتی سین و، هەموو (جمــع الجوامــع)ی لەبەر بووە. زۆر کەس هەبوون لەویان زۆرتر خوێندووە و خوێندۆتەوە، وە لەویان زۆرتر لەبەر بووە، بەڵام کەس لەورۆژەدا نەگەیــشتووە بــەو. زەینێکــی تیــژ و، تێگەیشتنێکی زۆر بەرز و، بیرێکی ورد و قووڵ و، مێشکێکی فــراوان و ، دڵ و دەرونێکی کراوەی پان و پۆڕی بووە. هەرچیت لیّ ئەپرسی کوتوپڕ وەڵامی ڕاست و دروستی ئەدایتەوە، نەخوازەڵا شتی پێچراوەی ورد و قووڵ و قورس و گران، کە زانایان و دانایان خۆیان لیّ ئەپاراست، بەڵام ئەم بــە بــیر لێکردنەوەیــەك شــی ئــەکردەوە، وە هەرچــەند گــریّ کــوێرەی تێــدا بووایــە، بەســەر پەنجــەی بــیری ئەیکردەوە.

لە پاش ماوەیەك مەلا سەعید کــە تەماشــا ئــەکات لــە زانینــی بونــەوەری و سروشتی (العلوم الکونية و الطبيعية)دا بیّ ئاگایە، چونکە نەی خوێندوون، وە دێت ئەکەوێت بەسەریاندا و لەماوەیەکی زۆر کەم دا هەڵ ئەگەڕیّ لە زانــستی

[٣] دەقە ئەصڵیەکەی دەڵیّ:(بەشێکی مەقاماتی حەریری– جملة من مقامات الحريري).





مێژو و جوگرافیا و ریازیات و جیۆلۆجیا و فەلسەفەی کۆن و تازە، وە ئەم هەلگەڕانەی بوو بە سەرباسی (موچوع) خوێندەواران و نووسەران، لە ڕۆژنامەو گۆڤاری شارە گەورەکانی تورکیادا، تا هەموو زانایانی تورک[٤] بە کۆی دەنگ نازناوی (بدیع الزمان) یان پێ بەخشی.

(بدیع الزمان) هەموو ڕۆژێك بەیانیان ڕۆژنامەی ئەخوێندەوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان قسەی وەزیرێکی بەریتانی[٥] بەرچاو دەکەوێ کە لە مەجلیسی عمومی بەریتانیا دا وتویەتی: تا قورئان وا بەرێز و کاریگەر بێ لە دڵ و دەرونی موسڵمانانداا، ئێمە هیچمان پێ ناکرێت لە وڵاتی ئیسلامیدا، (بدیع الزمان) کە ئەم قسەی بەرچاو دەکەوێ دێتە گل و هەرچی خوێن ئەندامی هەیە دێتە کوڵ، وە بەو چەند قوتابییەی کە لەلای دانیشتوون دەڵێ: من لەمڕۆ بەدواوە خزمەتی قورئان دەکەم، وە شتی لێ دەردەهێنم و بڵاوی دەکەمەوە بەناو

---

[٤] لەڕاستی دا ئەو زانایانە تورك نەبوون، بەڵکو کورد بوون. چونکە هێشتا ئەوکاتە ناوبانگی (نوورسی) لە کوردستانەوە نەگەشتبووە لای تورکەکان.

[٥] وەزیری موستەعمەراتی ئەوکاتەی بەریتانیا بووە و ناوی (ولیام گلادستۆن)ە. لە نێوان ساڵەکانی (١٨٠٩–١٨٩٨ز)دا ژیاوە. چەند جارێك پلەی وەزیریی وەرگرتووە و چوار جاریش بە سەرۆك وەزیران هەڵبژێردراوە. لە تاوتوێ کردن و لێکۆڵینەوەی ئاییندا هێندە قوڵ بووەتەوە تا پسپۆڕی تێدا پەیدا کردووە. یەکەم دانراوی کتێبێکە بەناوی:( دەوڵەت و پەیوەندی بە کەنیسەوە). لەسەردەمی دەسەڵاتی خۆی دا کەنیسەی ئەیرەلەندی هەڵوەشاندەوە.









موسڵمانانداa. دوای ئەوە ئەچێت بۆ ئەستەمبوڵ بۆ ئەوەی زانستگایەك بكاتەوە لە وێنەی (جامع الازهر) و ناوی بنێت ( زانكۆی زەهراء )[٦] . بەگەیشتنی بۆ ئەستەمبول، هەموو ڕۆژنامەكان ئەنووسن كە لە ئاسۆی ئەستەمبوڵەوە زانایەك هەڵ كەوتووە مەشخەڵێكی ئاگری بەدەستەوەیە لە زیرەكی و بلیمەتیدا. بەڕێكەوت لەو كاتەی كە (بدیع الزمان) لە ئەستەمبووڵ دەبێ، شێخی (جامع الازهر) یش (شێخ بوخەیت)[٧] لەوێ دەبێت، ڕۆژێك لە ئەنجومەنێكدا هەردووكیان كۆ ئەبنەوە، شێخ بوخەیت لە بدیع الزمان دەپرسێت: ڕات چی یە لە دەوڵەتی عوسمانی و گەلانی ئەورووپا ؟!

---

[٦] مامۆستا نوورسی ویستوویەتی ئەو زانكۆیە لە كوردستاندا بكاتەوە كە مەڵبەندی سەرەكی لە شاری (وان) و دوو لقیشی لە (دیاربەكر) و( بەدلیس) بێت. بەمەش مامۆستا نوورسی یەكەم كەسە هەوڵی دامەزراندنی زانكۆی داوە لە كوردستاندا.

[٧] ناوی ( شێخ محەممەد بوخەیت كوڕی حسەینی حەنەفی موتیعی) یەو لە ڕاستی دا (موفتی میصر) بووە، نەك شێخی ئەزهەر. لە شارۆچكەی (موتیعە)ی سەربە پارێزگای (ئەسیووت) لە میصر لەدایك بووە. لە ئەزهەر خوێندویەتی و دوایی بووە بە مامۆستا تیایدا. پاشان ساڵی (١٢٩٧ك) بووە بە قازی دادگای شەرعی. پەیوەندی بە سەیید جەمالەدینی ئەفغانی یەوە كردووە. لە نێوان ساڵەكانی( ١٣٣٣-١٣٣٩ك) موفتی وڵاتی میصر بووە. گەلێ كتێبی بەنرخیشی نووسیوە. ساڵی (١٣٥٤ك)ماڵئاوایی لە ژیانی دنیا كردووە. بڕوانە:( سيرة ذاتية، بديع الزمان سعيد النورسي) ص ٨٤) و ( سعيد النورسي رجل القدر في حياة أمة ص ٥٥) ئەوانیش لە: ( الاعلام للزركاي ٦/٢٧٤).





ئەویش دەڵێ: ئەمڕۆ ئەوروپا ئاوسە بە ئاینی ئیسلام، ڕۆژێك دێت کە ئیسلام لە ئەوروپاوە بڵاو دەبێتەوە، دەوڵەتی عوسمانیش ئاوسە بە ڕژێمی ئەوروپا، ڕۆژێك دێت کە ببێ بە پەیکی ئەوروپا.

شێخ بوخەیت وەڵامەکەی زۆر پێ جوان دەبێت و ئەڵێ: ئەم وەڵامە لە بیری یەکێکی وەك بدیع الزمان)ەوە نەبێت دەرناچێت.

لە ساڵی (١٩٠٨ز) کە (محمد رەشاد) هاتە سەر تەخت، وە کۆمەڵی ( اتحاد و ترقی) هاتنە سەرکار- کە دروشمیان ئازادی بوو، وە ئەمانە بە دیمەن موسڵمان بوون، بەڵام لە ژێرەوە بەپەنجەی جولەکەو ماسۆنی ئیشیان دەکرد. لەبەرئەوە (بدیع الزمان) نەی وێرا ڕووبەڕوو بچێ بە گژیاندا[8]، چونکە زۆر کەس لە سادەو تێنەگەشتوانیان هەڵخەڵەتاندبوو بە دیمەنی دروشمی (اتحاد و ترقی) کە ئەوانە لایان وابوو کە بەگژداچوونی ئەو کۆمەڵەیە وە ئەوەیە بەگژ ئیسلامدا

---

[8] ڕەحمەتی خوا لە مامۆستای خاڵ! نازانم ئەم تەعبیرەی لەکوێ هێناوە کە دەڵێ: (نەی وێرا)؟ خۆ نە لەدەقە ئەصڵیەکەدا و نەلە هیچ سەرچاوەیەکی باسی ژیانیدا شتی لەو جۆرە نی یە. تەنانەت سەرانسەری ژیانی مامۆستا نوورسی یەك نمونەی بچوکیشی تێدا نی یە کە بەڵگەی نەوێرانی بێت، بەڵکو بە پێچەمدوانەوە، یەکێ لەو تایبەتکاریانەی کە مامۆستا نوورسی ناوبانگی پێ دەرکردووە نەترسان و بوێری بووە. تەنانەت هەندێ جار لەسەر ئازایەیی و نەترسانی لەو هەڵوێستانەدا کە پیاوی ئازا و بوێر تیایدا ترساوە بە شێتیان لەقەڵەم داوە! هەندێ جاریش لەو پێناوەدا بەرەو پەتی سێدارە براوە! وتارەکانی بۆ پشتگیری (ئیتحادی محەممەدی) نمونەیەکی بەرجەستەی نەترسانی ئەون.







چوویی. لەبەر ئەوە بدیع الزمان هات کۆمەڵێکی ئیسلامی ڕێك خست بە ناوی ( کۆمەڵی یەکێتی محمدی) یەوە[٨]، ئەمیش وەکو ئەوان دروشمەکەی ئازادی بوو، بەڵام ئەوەندە بوو ئەم دەیویست ئەم ئازادیە ببەستێتەوە بە ئیسلامەتیەوە، چ لە ڕووی (تشریع) و چ لەڕووی بیر و باوەڕەوە ( عقیدە).

بە دانانی ئەم کۆمەڵە هەر زوو هەزاران کەس لە هەموو لایەکی تورکیاوە پێوەی نوسا و خۆیان پیا هەڵواسی، بدیع الزمانیش یەك لەسەر یەك وتاری بەرزو بەنرخی ئاینی لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەکردەوە و ئەو داوەی کە (اتحادیەکان) لێیان ئەدا، ئەمانیش هەر لەو داوەیان دەدا و ئەی وت: ئەگەر ئێمە پەنا نەبەینەبەر ئەو ئازادیەی کە ئیسلام خەتی کێشاوە، ئەبین بە قوربانی ئەو ئازادیەی کە (ایتحادیەکان) ئەیڵێن.

بەم شێوەیە موسڵمانانی بێدار دەکردەوە لەو خەتەرەی کە لە دڵی (ایتحادیەکان) دا بوو، لە کاتێکدا ئەوان نەیان ئەتوانی هیچ نەنگێك لەمان بگرن، چونکە ئەمانیش هەر بە دروشمەکەی ئەوان بانگیان دەکرد، بەڵام ئەوەندە هەبوو کە هەرچی ئەمان بوون دەیان ویست خێرا کۆمەڵێکی ئیسلامی ڕێك

---

[٨] سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مامۆستا نوورسی دامەزرێنەر و ڕێکخەری (کۆمەڵەی ئیتیحادی محەممەدی) نەبووە، بەڵکو لایەنگر و پشتگیرێکی تەواو کارا و دڵسۆزی بووە، وەك چاو ساغێك ڕێنمایی پێویستی پێشکەش کردوون تاکو بەهەڵەدا نەچن.





بخەن، وە هەرچی ئەوانیش بوون دەیان ویست حیزبەکەیان بەکار بهێنن بۆ زەبون کردنی هێزی ئیسلام، تا بتوانن قەومیەتی تورانی دابنێن لە جێگای ئەو.

بەڕاستی ئەم کارەی بدیع الزمان ترس و بیمێکی زۆری خستبووە ناو دڵی ماسۆنی یەکانەوە، چونکە بە چەقەی ئەوان ایتحادیەکان هەڵئەسوڕان، لەبەر ئەوە ماسۆنیەکان سەرۆکەکەی خۆیان کە دەوڵەمەندترین جولەکەبوو(قەرەصو) ناردیان بۆلای (بدیع الزمان)، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو هاتە دەرەوە و بە هاورێکانی وت: وەخت بوو ئەم کابرایە لەدەریای ئیسلامەتی دا نوقمم بکات ! ئەم (قەرەصو) یە یەکەمین صەهیۆنی ماسۆنی بووە کە هەوڵێکی زۆری داوە بۆ روخاندنی خەلافەتی عوسمانی و لابردنی سوڵتان عبدالحمید و داگیرکردنی فەلەستین.[8]

## مەحکەمەی یەکەمی بدیع الزمان

ایتحادیەکان هیچیان بۆ نەمایەوە تەنها ئەوە نەبێ کە ( بدیع الزمان) بگرن و محاکەمی بکەن. لەبەر ئەوە لەدوای روداوی ٣١/مارت/١٣٢٥ رۆمی (١٣/نیسان/١٩٠٩ز)[9]- کە (١٥) موسڵمانی تێدا هەڵواسرا – (بدیع الزمان)

---

[8] هەروەك ئەندامێکی دیارو بەرجەستەی (مەحفەلی ماسۆنی)و، سەرۆکی حاخامەکانی ئەستەمبوڵ و نوێنەری شاری(سولانیك)یش بووە لە پەرلەمانی ئیتیحادیەکاندا.

[9] لێرەدا دەستنووسەکە بە نارێکی نووسرابوو، راستمان کردەوە.





یش گیراو نێردرا بۆ ئەو مەحکەمەیەی کە حوکمی ئەو (١٥) کەسەی تێدا درابوو. وا دەرئەکەوێ کە ئەمە هەر بۆئەوەبووە کە بدیع الزمان بترسێنن.

دوای ئەوەی کە (خورشید پاشا)ی سەرۆکی مەحکەمە حوکمی ئەو پازدە کەسەی داو جێ بەجێ کرا، ئینجا دەستی کرد بە محاکەمەی (بدیع الزمان). یەکەمجار پێی وت: تۆش داوای بەراورد کردن (تگبیق)ی[١٠] ئیسلامی دەکەی ؟!

(بدیع الزمان)یش وتی[١١]: ( ... ئەگەر هەزار گیانم هەبێ هەر هەزاری ئەکەم بە قوربانی ئیسلام، وە من دان بە هیچ دەستورێکدا نانێم بە دەستوری ئیسلامەتی دا نەبێ، وە هەمووشتێك بە تەرازوی شەریعەت ئەکێشم، من ئامادەم بە شەوق و خۆشیەوە بچم بۆ بازاڕی مردن و قیامەت، وە ئامادەم لەگەڵ ئەو ١٥ کەسەی کە هەڵواسران منیش لەوێ یەدا بڕۆم وە لەگەڵ ئەواندابم.

ئەنجامی ئەم مەحکەمەیە ئەوەبوو کە حوکم درا بەسەر (بدیع الزمان) دا بە بەندی بۆ ماوەیەك، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو ئازادکرا[١٢]. دوای ئەوە (بدیع

---

[١٠] لەوانەیە وشەی (تطبیق) لێرەدا زیاتر (جێبەجێ کردن)ی بۆ دەست بدات.

[١١] هەروەك مامۆستا محمد سەعید ڕەمەزان بۆتانی دەقی هەموو بەرگری یەکەی مامۆستا نوورسی نەهێناوە کە لە دادگادا پێشکەشی کردووە، مامۆستای خاڵیش هەموو ئەو بڕگانەی وەرنەگێڕاوە کە لە عەرەبی یەکەدا هەن.

[١٢] سەرچاوەکان ئاماژە بەوە ناکەن کەهیچ حوکمێك درابێت،بەڵکودەڵێن: هەرچەندە چاوەڕوانیی حوکمی ئیعدام دەکرا بۆ(بدیع الزمان) بەڵام حوکم نەدرا و ئازادکراوە.






الزمان) لە ئەستەمبوڵ نەمایەوە و چوو بۆ (وان) لەوێ دەستی کرد بە دەرس وتنەوە و نووسین.

مەحکەمەی دووەم

هەشت ساڵ ( بدیع الزمان) لەو جێگا دورە مایەوە بەبێ کەس. ئەم ماوەیە خۆی خواردنی بۆخۆی درووست دەکرد و جل و بەرگی خۆی دەشۆرد و کاروباری خۆی جێبەجێ دەکرد. بەڵام پورتەوی ئیمان و باوەڕ و تیشکی زانین و زانیاری لە درز و قەڵەشی دەرگا و پەنجەرەکانی یەوە ئەچووە دەرەوە لە جاران چاکتر، وە نامەی نوور لە جاران بەهێزتر و جوانتر و ڕێك و پێکتر بڵاو دەبوویەوە، ناچار ئەم جارە ڕەوانەکرا بۆ بەندینخانەی ( ئەسکی شەهر) وە لەوێوە نێردرا بۆ مەحکەمە بە تۆمەتی ڕێکخستنی کۆمەڵێکی پەنهانی بۆ روخاندنی حکومەتی ئەتاتورك، لە پاش مەحکەمەیەکی دوور و درێژ و لێکۆلچینەوەیەکی زۆر هیچیان لەسەر نەدۆزیەوە، لەبەر ئەوە هەر یانزە مانگ حوکم درا.

مەحکەمەی سێ یەم

مستەفا کەمال تەماشای کرد[13] ئەم نامەی نورە وەك بومەلەرزەیەکی زۆر بەهێز و تین و تەوژم، کۆشکی حکومەتەکەی هێناوەتە شەق و شۆق، وە نەی

---

[13] راستتر وایە بوترێ: (رژێمەکەی مستەفا کەمال) چونکە ئەم رودواوە لە بەرواری (٢٠/٩/١٩٤٣ز)دابووە.لەلایەکی تریشەوە مستەفا کەمال لە (١٠/١٠/١٩٣٨ز)دا مردووە.





ئەزانی چی بکات، چونکە ئەم نامانە نەدەم بۆ سیاسەت ئەبەن و نە ناوی کەس ئەبەن، هەروەك ناوی ناوی حکومەتیش نابەن بەڵکو هەمووی هەر ئامۆژگاری ئاینی یە، وە پایەداری ئاینی ئیسلامیش بەسە بۆ روخاندنی هەموو دەستورێکی تر.

لەبەر ئەوە مستەفا کەمال خێرا کۆبونەوەیەکی نهێنی پێك هێنا لەگەڵ پیاوە گەورەکانی ماسۆنی، کە هەموو دەستیان هەبوو لە روخاندنی خەلافەتی ئیسلامی و دامەزراندنی کۆمارێتی تورك لەسەر بنیاتێکی بێدینی، وە بڕیاریاندا لەسەر گرتنی (بدیع الزمان) و ناردنی بۆ محاکەمە بەتۆمەتی ئەوەی کە کۆمەڵێکی نهێنی ڕێك خستووە بۆ روخاندنی مستەفا کەمال و حکومەتەکەی. دوای چەند ڕۆژێك لیژنەیەك دانرا لەو ماسۆنیانە بۆ لێکۆڵینەوە لەو چەند نامانەی کە دەستیان کەوتبوو، بەڵام (بدیع الزمان) رایگەیاند کە من بەم لیژنەیە رازی نیم، وە داوای کرد کە لیژنەیەکی تر دابنرێت لە فەلاسیفەی ئەوروپا و ڕۆشنبیرانی جیهان. پاشان حکومەت ئەو لیژنەیەی لابردو لیژنەیەکی تری دانا، لەپاش لێکۆڵینەوەی نامەکان بڕیاریاندا کە ئەو نامانە نە پەیوەندیان بە سیاسەتەوە هەیە و نە بە حزبایەتی یەوە. بەڵام دووبارە (بدیع الزمان) گومانبار کرا کە گوایە چاوی لە سەرۆکایەتی یەکی دینیە بۆ ئامانجێکی سیاسی خۆی. بەڵام لەمەشدا هەر سەرنەکەوتن، چونکە ژیانی ئەم هەژارە لەیەکەم ڕۆژی ژیانیەوە تا ئەو ڕۆژە زۆر دور بووە لە گەورەیی و سەرۆکایەتی و





رابواردن بە خۆشی. هەربەو شێوەیە لەم مەحکەمەیەشدا بە پاکی دەرچوو لە ڕۆژی ١٥/٦/١٩٤٤ز، بەڵام لەپاش چی ؟! لەپاش هێنان و بردنێکی زۆر و درێژکردنەوەی مەحکەمەکە بەبێ هودە.

مەحکەمەی چوارەم

لە ساڵی (١٩٤٨ز) دیسان ترس و بیم ڕوی کردەوە دڵی سەرۆك و کاربەدەستەکانی تورکیا، وە بە چاوی خۆیان ئەیان بینی کەوا لافاوی نامەی نوور هەموویان راپێچ دەکات، وە پێشانگای زانین و زانیاری گەلی تورك لە زانایان و وێژەران و خاوەن بیرانی بەرز و مامۆستای زانستگاکان، بێ پەروا دوای ئەم شۆڕشە ئەکەون، وە چونە ژێر بەیداخی نامەی نوورەوە، لەبەر ئەوەحکومەتی تورك دیسان بڕیاری دا (بدیع الزمان) بگیرێتەوە لەگەڵ زۆرێك لە گەورە پیاوانی نوور، وە نێردران بۆ مەحکەمەی سزای گەورە لە ویلایەتی (ئافیون) هەربە گومانبارییەکەی جاری پێشوو. ئەمجارەش دیسان (بدیع الزمان) خرایەوە زیندان، بەڵام زیاد لە جاران، خرایە زیندانێکی قوڵی ئاوەزێی ساردی بۆگەنی تەنگ و تاریك، خواردنیشی ڕۆژی دووجار، جاری پارچەیەك کولێرەی ڕەق لەگەڵ پەرداخێك ئاو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمجارە زەهریشیان دەرخوارد دا لەگەڵ یەکێك لە ژەمەکاندا، بەڵام خوا بە میهرەبانی خۆی رزگاری کرد[١٤].

---

[١٤] لە نێوان ساڵانی (١٩٢٢-١٩٤٦ز) یازدە جار مامۆستا نوورسی ژەهری دەرخواد دراوە ! ساڵی (١٩٤٨ز)یش لە بەندینخانەی (ئافیوون) سێ جار،بەمەش هەمووی دەکاتە پازدە جار





محاکەمەی ئەمجارەی (بدیع الزمان) گرنگترین روداوی ساڵی (١٩٤٨ز) بوو لە توركيا، وە هەرچی گۆڤار و ڕۆژنامە هەبوو هەموو چاوەڕوانی ئەم محاکەمەیە بوون، تا گوێ بگرن لە بەرگری (بدیع الزمان) وە بزانن ئەنجامی ئەم محاکەمەیە بە چ لایەکدا ئەکەوێ، بەڵێ لە پاشان روداوی ئەم محاکەمەیە تۆمار کرا لەگەڵ ئەو بەرگریەی کە (بدیع الزمان) و ئەو مریدانەی کە لەگەڵیا مەحکەمێەکران لە فایلێکی گەورەدا بە ناوی محاکەمەی سزای (تافیون). ئەو حوکمەی کە ئەمجارە درا بەسەریدا هەر بەندکردنی بۆ ماوەی بیست مانگ. بەڵام کۆمەڵێك لە پارێزگاران بڵاویان کردەوە کە ئەم حوکمە شەرعی نیە، چونکە لەسەر هەمان گومانباریی جاری پێشوو سزا درابوو، وە هەرکاتێ حوکمی پێشوو بێ گوناهی (بدیع الزمان)ی سەلماند ئەوا بۆیان نیە جارێکی تر بەو گومانە تۆمەت باری بکەنەوە.

بەم جۆرە تەمیز کرا، بەڵام مەحکەمەی تەمیز بڕیاری خۆی تێدا نەدا تاکو (بدیع الزمان) بیست مانگەکەی خۆی تەواو کرد لە زینداندا، مەبەستیش تەنها ئەوەبوو کە بدیع الزمان و موریدەکانی لە ئیش و کاری دینی بکەون. دوای ئەوەی (بدیع الزمان) مایەوە لە (ئیسپارتە) دوور لە هەموو کەسێك تا پێش مردنی بە سێ ڕۆژ لە گەڵ دوان لە موریدەکانی چوو بۆ (ئورفە) لە

---

کە چەهری بۆکراوەتە خواردنەوە! خوای گەورە لە هەموویان ژیانی پاراستووە، بەڵام زیانی زۆری لە سەر تەندروستی بەجێ هێشتووە. بڕوانە:(سيرة ذاتية)ص ٣٨٥،٣٦٠، ٤٣٦ .





ئۆتۆمبێلێکی بچوکدا بەبێ پرسی حکومـەت، پـێش ئـەوەی بگەنـە (ئورفـە) ئەفسەرێك و چەند سەربازێك ڕێیان پێ گرتن، وە پێ یان وتن، ئەبێ بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتوون، بەڵام (بدیع الزمان) بە ئەسپایی پێی وتـن: من ناتوانم ئێستا بگەڕێمەوە، بەڵام دڵنیابن کە من لە دوو ڕۆژ زیاتر لە ئورفە نامێنمەوە، ئەفسەرەکە وازی لێ هێنان، وە ئەوان چوون بۆ ئورفە[١٥]، دوای دوو ڕۆژ لـە ئورفـە کـە شـەوی چوارشـەمە (٢٥)ی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٣٧٩ك) بەرامبەر بە (١٩٦٠/٣/٢٣ز) – (بدیع الزمان) کۆچی دوایی کرد، وە دەنگـی کۆچی لە هەموو جیهانی ئیسلامی دا بڵاو بوویەوە. دوای ئـەوەی کـە (بـدیع الزمان) لە ئوورفە نێژرا و ماوەیەکی بەسەردا چوو[١٦]، شەوێك چەند پیاوێکی حکومەت لە نیوەشەوێك دا بە فڕۆکـە چـوونە سـەر گۆڕەکـەی و لاشـەکەیان دەرهێناو بە فڕۆکە بردیان بۆ شوێنێکی نادیار، ئێستاش (بدیع الزمان) گـۆڕی ئاشکراو دەست نیشانکراوی نی یە.

هەزاران ڕەحمەت لە (بدیع الزمان) مەلا سەعیدی نورسی بۆ ئـەو هەڵوێـست و بەرگریانەی کە پەنجاو یەك سـاڵ بـەردەوام بـوو لـە دژی هێرشـی ماسـۆنی و صەهیۆنی و مستەفا کەمال کردی و بەرگری لە دینی خودا کرد، وە ملیۆنێـك

---

[١٥] سەرچاوەکان دەڵێن: ئەم ڕێ پێ گرتنەی ئەفسەرەکە لەناو ئۆتێلەکەدا بووە لە شاری (ئوورفە) لەلایەن ئەفسەری ئاسایشەوە.

[١٦] ئەم ڕوداوە لەسەرەتای مانگی تەموزی هەمان ساڵدا بووە. واتە دوای نزیکەی چوار مانگ لە کۆچی دوایی مامۆستا نوورسی.





گەنجی تورکیای پێ گەیاند بە پەروەردەیەکی ئیسلامی، وە هەمووی کردن بە پێشمەرگەی ئیسلام تا لە کۆتاییدا مستەفا کەمال نەماو ئیسلامەتی وەك خۆی مایەوە. بەڵکو ئیسلامەتی ئێستای تورك ئیسلامەتییەکی پاك و تەمیز و دوور لە هەموو درۆ و دەلەسە و فرۆفێڵێکە، وە مانەوەی ئیسلام بەم جۆرە لە تورکیادا بەهۆی ئەو بەرگرییەوە بوو کە (بدیع الزمان) کردی.

* تیرۆرکردنی خەلیفە (الراشد بالله):

لە (٢٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٣٢ ك) بەرامبەربە (٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١١٣٨ ز) خەلیفەی عەباسیەکان (الراشدبالله) لە ئەسفەهان کوژرا، ئەوەبوو دەستەیەك لە خەڵکی خوراسان تیرۆریان کرد.

* زانای گەورە (فخرالدین الرازی) لە دایك بوو:

لە (٢٥) ڕەمەزانی ساڵی (٥٤٤ ك) بەرامبەربە (٢٦)ی کانونی دووەمی ساڵی (١١٥٠ ز) محمدی عمری کوڕی حسین ی کوری علی، زانای شارەزا لە شەرع و ئوسوڵ ناسراو بە (فخردین الرازی) و (مفاتیح الغیب) لەدایك بوو،کە خاوەنی تەفسیری قورئانی پیرۆزە کە لەناو زانایاندا بە چاکترین تەفسیرەکانی قورئان دادنرێت، جگەلەوەش زیاتر لە ١٠٠ بلاوکراوەو کتێبی هەیە.

* مەغۆلەکان دەشکێن:

لە (٢٥)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٥٨ ك) بەرامبەربە (٣)ی ئەیلولی ساڵی (١٢٦٠ز) شەڕی (عەین جالوت) دەستی پێ کرد لە نێوان موسڵمانەکان بەسەرۆکایەتی (سیف الدین قطز) و مەغۆلەکان بە سەرۆکایەتی (کیتوبوقا)، لەئەنجامدا موسڵمانەکان سەرکەوتنێکی گورەیان بەدەست هێنا و ڕێگەیان گرت


لە دەست درێژیەکانی مەغۆل و شارستانیەتی ئیسلامیان لەدەستی چەپەڵی ئەوان پاراست.

* محمد فرید لە دایك بوو:

لە (٢٥) ڕەمەزانی ساڵی (١٢٨٤ ك) بەرامبەر (٢٠)ی کانونی دووەمی ساڵی (١٨٦٨ ز) گەورەی میسر (محمد فرید) لەدایك بوو کە یەکێك بوو لە گەورەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی لە میسر، سەرۆکایەتی حیزبی نیشتمانی گرتە ئەستۆ لە پاش مردنی (مصطفى کامل)ی سەرۆکی ئەو حیزبە. ئەوە بوو (محمد فرید) هەموو هەوڵی خۆی خستەگەڕ لە پێناو خزمەت کردنی کێشەی میسر و بەدەست هێنانی سەربەخۆیی میسردا، لەوپێناوەدا چەندین جار بەرنگاری داگیرکەران بووەوە، بەڵام جێگەی داخە لە وڵاتی غەریبی و دوور لە خاك و نیشتمانی خۆی و لە ئەڵمانیا وەفاتی کرد. چەندین بەرهەمی مێژوویی گرنگی لەدوای خۆی بە جێهێشتوە لە دیارترینیان (تأريخ الدولة العلية العثمانية).

* سەرکەوتنەکەی شێخ احمد موختار:

لە (٢٥)ی ڕەمەزان دا سەرکردەی ناوداری جیهانی (شیخ احمد مختار پاشا) سەرکردە لە دەوڵەتی عوسمانی توانی گەورەترین سەرکەوتن بەسەر سوپای ڕوسیا تۆمار بکات لە شەڕی (یخنیلر)دا، لە کاتێکدا ژمارەی هێزەکەی تەنها (٣٤) هەزار کەس بوو بەرامبەر سوپای ڕوسەکان کە بە ٧٤٠ هەزار کەس دەخەمڵێنران، ئەوەبوو ڕوسەکان ١٠ هەزار کەسیان لێ کوژرا.

* لە (٢٥)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٢٢١ك) پێشەوا (احمد ی کوڕی حنبل) دوای ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر بەبێ هۆشی بەریاندا کاتێك بەهۆش خۆی





هاتەوە هەندێك خواردنیان بۆ هێنا، فەرمووی من بە ڕۆژوم و بەردەوامیش بـوو لەسەر ڕۆژوەکەی، پێشەوا بوخاری دەڵێ: گوێم لە (اباالولید ی طیالیـسیة) بوو دەیگوت: ئەگەر احمدی کوڕی حنبل لەناو بەنی ئیـسرائیل بووایـە گـەورەترین ناوبانگی دەردەکرد.

ئەو کەسەی شەوی بیست و پێنجی مانگی ڕەمـەزان بـە نوێـژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، ئەوا خـوای گـەورە لـە کـاتی مردنـی ئەوکەسەدا (ملك الموت) لە سەر جوانترین شێوە دەنێرێ بـۆلای و سـەلامی لێ دەکـات و مـژدەی نـازو نیعمەتـە نـەبڕاوەکاتی بەهەشتی پێدەدات...

(پێشەوا علی)

ئەگەر ئەوەی لە خەڵکانی ڕابردوو بە ئەزموون ومرمان گرتووە بەکاری بهێنین، وەك ئـەوە وایە دووجار ژیابێتین. (وتە)




دوعای ڕۆژی بیست و شەشەمی مانگی ڕەمەزان:

اللهم اجعل سعيي فيه (في رمضان) مشكورا، وذنبي فيه مغفورا، وعملي فيه مقبولا، وعيوبي فيه مستورا يا اسمع السامعين.



ی

ڕەمەزان

* گەڕانەوە لە غەزای تەبوك:

لە (٢٦) ڕەمەزانی ساڵی (٩ ك) بەرامبەر (٥)ی کانونی دووەمی ساڵی (٦٣١ ز) پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی ڕەزای خوایان لێ بێ لە غەزای تەبوك گەڕانەوە، ئەو غەزایەی کە هەندێك لە هاوەڵان بەبیانوی جۆراوجۆر دواکەوتن، سەرەتاش کە پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە ڕووی کردە مزگەوت و نوێژی کرد، پاشان ئەوانەی کە دواکەتبوون هەندێکیان هاتن و بیانوی جۆراوجۆریان دەهێنایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) گوێی لێ دەگرتن، ئەوەبوو بڕیار درا بەفەرمی لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە پەیوەندی لەگەڵ (کەعبی کوڕی مالك) و دوو هاوەڵەکەی بپچڕێنن و بۆماوەی (٥٠) ڕۆژ کەس قسەی لەگەڵا نەکردن بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) پاشان خوای گەورە ئایەتی نادرە خوارەوە و تێیدا بڕیاری لێخۆش بوونی ئەو سێ هاوەڵەی دەرکرد.

* لە (٢٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٣ ك) بەڕێز (نەفیسەی کچی حسن کوڕی زەیدی کوڕی حسن ی کوڕی عەلی (ڕەزای خوا لەهەموویان بێت)،گەیشتە قاهیرە. نەفیسە خان لە ناودارترین ئافرەتانی ئالویەیتی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، ئافرەتێکی زاناو خواناس و ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بوو. دوای ئەوەی کە کوڕەمامی خۆی (ئیسحاق المؤتمن ی کوڕی جعفری صادق) خواستی و




مارەی کردو پاشان لەگەڵ مێردەکەیدا لە شاری مەدینەی پیرۆزەوە رویان کردە شاری (خەلیل) بۆ سەردانی کردنی قەبری (ابراهیم) پێغەمبەر (ﷺ)، پاشان لەوێشەوە رویان کردە میسر و لە دەرەوەی شاردا خەڵکێکی زۆر بە وشەی (الله اکبر ولا اله الا الله) پێشوازیان لیّ کردن و لەوێشەوە چوونە قاهیرە. لەوێ لەماڵی ئافرەتی ناودار (أم هانی) لایدا کەماڵێکی فراوان و گەورە بوو، ئەوەبوو خەڵکی بەلێشاو دەهاتن بۆلای و زیارەتیان دەکرد تاوای لیّهات ناچار بوو بڕیار بدات کە بگەڕێتەوە شاری پێغەمبەر (ﷺ) مەدینە. بەڵام خەڵکەکە کە پێیان زانی رێگەیان پیّ نەداو وتیان ناهێڵین کەسێکی ئاوها موبارەك لەناو ئێمەدا بڕوات، ئەوە بوو (والی میسر) بڕیاری دا کە دەبیّ هەفتەی دوو رۆژ دیاری بکرێت بۆ سەردانی کردنی و رۆژەکانی تریش تەرخان بکات بۆ عیبادەتی خوای گەورە، ئەویش رازی بوو بڕیاری مانەوەی دا.دەسەڵات دارانی میسر هەستیان بە گەورەیی ئەو ئافرەتە دەکرت، بۆیە کەسێکی وەك (کوڕی تۆلون) (ابن طولون) کە یەکێك بوو لەو کەسانەی کە زوڵم و ستەمی لە خەڵك دەکرد، رۆژێکیان لەلای راستیەوە وەستابوو، پارچە کاغەزێکی پێدا تا ئامۆژگاریەکی بۆ بنوسێت، ئەویش ئەم چەند دێرەی بۆ نوسی: شتتان کەوتە بەردەست خەڵکتان کردە بەندەی خۆتان، کاتێك دەسەڵاتتان هەبوو کەوتنە چەوساندنەوەی خەڵکی، کرانە ئەمیندار لاتاندا، ماڵی خەڵك کەوتە ژێردەستان خەڵکیتان لیّ بیّ بەشکرد، لەگەڵ ئەوەشدا دەتان زانی کە دەمرن، بەتایبەتی دڵانێکتان ئازار داوە کە لێی بەرپرسیارن، چەندین خەڵکتان برسی کردووە، چەندین خەڵکتان بیّ جل و بەرگ کردووە، چاك بزانە کە ناکریّ زوڵم لێکراو بمریّ و زاڵمیش لە ژیاندا بمێنیّ.





ئەم چەند وشە جوانە زۆر کاری لە کوڕی (تۆلون) کردو بڕیاری دا دەست لە زوڵم و ستەم هەڵبگرێت، شایانی باسە (نەفیسە خان) لە ژیانی خۆیدا قەبرێکی هەڵکەندبوو وەسیەتی کردبوو کە لەوێدا بینێژن، تا لەژیاندا بوو توانی (٢٥)جار قورئان لە ناو ئەو قەبرەدا خەتم بکات.

* لە (٢٦)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٠٧ك) بەرامبەر بە (١٩٨٧/٥/٢٥ز) حکومەتی بەعس بۆردومانی گوندەکانی ناوچەی بالیسانی کرد.

* زەنجیەکان:

لە (٢٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢٥٥ ك) بەرامبەر بە ساڵی (٨٦٩ ز) سەرەتای دەست پێکردنی شورشی (زەنجیەکان) بوو، زەنجیەکان بەو هۆزانە دەوترا کە لە دەشتاییەکانی ئەفریقادا خەریکی چاندن و چنینی پەمو و لۆکە بوون. مێژونووسانی عەرەب زەنجیەکان بەو بەندە ڕاپەڕیوانە ناو دەبەن کە بە سەرۆکایەتی (علی کوڕی عیسی)ی ناسراو بە (البرقعی) و بە پاڵپشتی (قرامطة)ەکان ڕاپەڕینێکیان دروست کرد و ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆریان بۆ بەشی خواروی عێراق دروست کرد، ئەم حاڵەتە ماوەی ١٥ ساڵ ی خایاند. فیتنەو ئاشوبی زەنجیەکان دەنگۆیەکی زۆری دروست کردبوو.

* عبدالرحمن خەلدون وەفات دەکات:

لە (٢٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨٠٨ ك) بەرامبەر بە (١٦)ی ئازاری ساڵی (١٤٠١ز) زانای فەرهەنگی و پێشەنگی زانستی کۆمەڵایەتی (عبدالرحمن خەلدون) وەفاتی کرد، ئەم زانایە بە ناودارترین زانای مێژو ناوزەد دەکرێت و





باس ولێکۆڵینەوەکانی لەبارەی (مێژو ، ژیاننامەی خودی (ذاتی)، لێکۆڵینەوە پەروەردەییەکان و هتد...) بەسەرکەوتوترین باسەکانی دادەنرێن.

* ناپلیۆن شاری (یافا) داگیر دەکات:



لە (٢٦)ی رەمەزانی ساڵی (١٢١٢ ك) هێزەکانی فەرەنسا کە ناپلیۆن سەرکردایەتی دەکرد گەیشتە دەورووبەری (یافا) دوای چوار رۆژ روبەڕو بونەوە و بەرگری کردن لەلایەن دەسەڵات دارانی (یافا) ئەوە بوو ناپلیۆن چووە ناو یافا و دەستی بەسەرداگرت و داگیری کرد.

* کۆتایی هێنان بەشەڕی (٩) ساڵە بەڵام ؟

لە (٢٦)ی رەمەزان دا دەوڵەتی عوسمانی پەیمان نامەی ئەستەمبوڵی مۆر کرد لەگەڵ وڵاتی ئێران دا لە پێناو کۆتایی هێنان بەو شەڕەی کە ماوەی (٩) ساڵ بوو لە نێوانیاندا هەڵگیرسا بوو ، لە پەیمان نامەکەدا سنوری هەردوولا دیاری کرابوو، بەڵام ئەم رێکەوتنە زۆری نەخایاند و دوای دووساڵ شەڕ لە نێوانیاندا دەستی پێکردەوە.

ئەو کەسەی شەوی بیست و شەشی مانگی رەمەزان بە نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، پاداشتی وەکو ئەوکەسە وایە کە شەیدای لیقای خوای گەورەیە و حەزدەکات بە لیقای خوا بگات...

(پێشەوا علی)




**دوعای ڕۆژی بیست و حەوتەمی مانگی ڕەمەزان:**

**اللهم ارزقني فيه (في رمضان) فضل ليلة القدر، وصير اموري فيه من العسر الى اليسر، واقبل معاذيري و حط عني الذنب والوزر، يا رؤوفاً بعباده الصالحين.**



**ی ڕەمەزان**

* دابەزینی قورئانی پیرۆز:

لە (٢٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣)ی پێش کۆچی قورئانی پیرۆز لە شەوی پیرۆز (لیلة القدر) دا لە (لوح المحفوظ)ەوە دابەزیە (بیت العزه) لە ئاسمانی یەکەم.



* چوارەم خەلیفەی ئەمەویەکان وەفات دەکات:

لە (٢٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣٩٢ ك) بەرامبەر (١٠٠٢ ز) چوارەم خەلیفەی ئەمەویەکان (الحاجب المنصوری کوڕی محمدی کوڕی عبدالله کوڕی ابی عامری معافری) لە تەمەنی ٦٥ ساڵی دا لە ئەندەلوس وەفاتی کرد.









*** ابراهیم پاشا ولاّتی سلۆفاکیا دەگرێت:**

**لە (٢٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٠٩٣ ك) بەرامبەربە (٢٩)ی ئەیلولی ساڵی (١٦٨٢ ز) ئەوزون – أوزون – ابراهیم پاشا سەرکردەی دیاری عوسمانیەکان توانی دەست بگرێت بەسەر قەلاّی (فولك الحصينه) لە (سلۆفاکیا) جگە لەوەش توانی دەست بگرێت بەسەر ٢٨ قەلاّی تری ئەو ناوچەیەدا، پاشان ئەم سەرکردە لێهاتووە توانی هەموو (سلۆفاکیا) بخاتە ژێر دەسەلاّتی خۆیەوە.**

*** سوپای عوسمانیەکان هێرش دەکاتە سەر ئەورووپا:**

**لە(٢٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (١١٠٧ ك) بەرامبەربە (٢٠)ی نیسانی ساڵی (١٦٩٦ ز) سولتانی عوسمانی هێرشێکی بەرفراوانی کردە سەر ئەورووپا، دوای شەڕێکی توند لەگەڵ ئەڵمانەکاندا عوسمانیەکان توانیان سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنن. هێرشەکە نزیکەی شەش مانگی خایاند.**

*** بانکێکی ئیسلامی لە قەتەر دەکرێتەوە.**

**لە (٢٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٨٣ز) یەکەم بانکی ئسلامی لە ولاّتی قەتەر کرایەوە کە سەرمایەکەی (٢٠٠) ملیۆن ریاڵ بوو.**

*** حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی مرد.**

**لە (٢٧) ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٩٥ك) حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی ماڵئاوایی لە دونیا کرد، حەجاج هەرچەند هەندێك خزمەتی بە مێژو و تەنانەت بە خودی ئیسلامیش کردووە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بە کەسێکی خوێن ڕێژ ناسراوە لە مێژوودا، بۆیە کاتێ هەواڵی مردنی حەجاج دەدەن بە (شێخ حسن ی بصری) کوڕنوشی بۆ خوای گەورە بردو سوپاسی خوای کرد.**





* پەردەی کەعبەی پیرۆز دەگۆڕن:



لە ٢٧ی ڕەمەزان دا پەردەو بەرگی کەعبە دەگۆڕدرێت، لە سەردەمی پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفانەوە وەك عادەتێك دانراوە کە هەموو ساڵێك دووجار بەرگی کەعبەی پیرۆز دەگۆڕن، جاری یەکەم لە ڕۆژی (٨)ی مانگی (ذی الحجة) و جاری دووەمیش لە (٢٧)ی مانگی ڕەمەزاندا، لەو سەردەمەوە تا ئێستا ئەو حاڵەتە بەردەوامەو هیچ کاتێك لەو کاتانە دوا نەکەوتووە.

* عبدالملك کوڕی مەروان دەبێتە دەسەڵات دار:

لە (٢٧)ی ڕەمەزان دا (عبدالملك کوڕی مەروان) ، دەسەڵاتی دەوڵەتی (ئەمەوی) گرتەدەست، عبدالملك بە گەورەترین خەلیفەکانی ئەمەوی دادەنرێت، ناوبراو شارەزایی باشی لە بواری (شەرع و ئیسلام) دا هەبوو جگە لەوەش کەسێکی خواناس و بۆ خوا سوڵحاو بوو، لەبەر ئەوە هەرلە تەمەنی ١٦ ساڵی دا بۆ ماوەی دووجار وەکو کاتی لەلایەن (پێشەوا معاویە)وە کاروباری شاری مەدینەی پێ سپێردراوە، لە دوای مردنی باوکیەوە دەسەڵات کەوتە دەستی و بەوەش توانی لەماوەیەکی کەم دا کاروباری دەوڵەت ڕێك بخاتەوە و ڕیزەکان تۆکمە بکات و هێز و قوەتی خۆی پیشان بدات، یەکەم کەس بوو لە مێژووی







ئیسلامدا کە دینار لە سککە بدات و ئامادەی بکات، شایانی باسە لەسەر ئەنگوستیلەی پەنجەی بە هەڵکەندراوی نوسرابوو (آمنت بالله مخلصا) ئەوەبوو لە



ساڵی (٨٦ ك) بەرامبەر بە (٧٠٥ ز) لە دیمەشق وەفاتی کرد.

* زانای ئیسلامی (احمد امین) وەفاتی کرد:

لە (٢٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٧٣ ك) بەرامبەر بە (١٩٥٤ ز) زاناو نوسەری گەورەی ئیسلامی (احمد امین)ماڵئاوایی لە دونیا کرد، ئەم زانا بەڕێزە جگە لەوەی هەر لەمنداڵییەوە قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە کەسێکی ڕەوشت جوان و ڕۆح سوك بووە لە بواری نوسینیش دا دەستێکی باڵای هەبووە، لە گرنگترین بەرهەمەکانی (فجر الاسلام) (ضحی الاسلام) (ظهر الاسلام)ە یەکێك لە دروشمەکانی کە بەردەوام دەیوتەوە و کاری لەسەر دەکرد ئەم دەستەواژە بوو (ارید ان اعمل لاان اسیطر).

هەر کەسێ شەوی بیست و حەوتی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو بکاتەوە، خوای گەورە ئەمر بە (رضوان)ی دەرگاوانی بەهەشت دەکات کە دەرگای بەهەشتی بۆ بکاتەوە...
(پێشەوا علی)

دوعای ڕۆژی بیست و هەشتەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم وفر حظي فيه (في رمضان) من النوافل، واكرمني فيه باحضار المسائل، وقرب فيه وسيلتي اليك من بين الوسائل، يا من لا يشغله الحاح الملحين.**



ی

ڕەمەزان

* پێغەمبەر(ﷺ) ام المساكين دەكاتە خێزانی خۆی:

لە (٢٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤)ی کۆچی بەرامبەریە (٦٢٦ ز) هەندێك دەڵێن لە (٥)ی ڕەمەزان پێغەمبەری سەرورمان محمد (ﷺ) خاتو زەینەبی کچی خزیمەی کوڕی حارس ی ناسراو بە (ام المساكين)ی هێناو کردیە خێزانی خۆی.

* وەفدێك موسڵمان دەبن:

لە (٢٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٩)ی کۆچی بەرامبەر (١)ی کانونی دووەمی ساڵی (٦٣١ ز) وەفدێکی (ثقيف) لە (طائف)ەوە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد و هاتنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام، ئەمەش دوای ئەوەهات کە هاوەڵان داوایان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە دوعای شەڕلە (ثقيف) بکات، پێغەمبەر(ﷺ) ڕوی کردە (قیبلە) هاوەڵان وتیان ئێستا دوعای شەڕیان لێدەکات و تازە لەناوچوون!! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اللهم اهدى ثقيفا و اتيني بهم مسلمون). ئەوەبوو هاتن و موسڵمان بوون و پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتدا شوێنێکی بۆ دابین کردن کە تێیدا دەمانەوە و







(عثمان ی کوڕی ابی العاص) کە گەنجترینی وەفدەکە بوو کردیە ئەمیریان ئەویش لەسەر داوای (تیمامی ئەبوبەکر) کە فەرمووی من وادزانم ئەم گەنجە لە هەموویان زیاتر حەزی لە شارەزابوون لەدین بێت و کەسێکی لێهاتوو دیارە، پێغەمبەر(ﷺ) هەمووشەوێك دەهات و قسەی بۆدەکردن ئەوانیش پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا کرد(ﷺ) دەربارەی ئەو بتەی کە دەیان پەرست واتە (اللات)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیشکێنن و بیڕوخێنن،ئەوانیش وتیان: بەخوا ئەگەر هەست بکات کە بەتەماین بیشکێنین ئەوا هەموومان دەکوژێت، (عمری کوڕی خطاب) وتی: ئەم نەزانیەتان تا کەی کورە ئەوە بەردە بەرد!!! ئەوانیش وتیان تۆ بێدەنگ بە ئەی کوڕی خەتاب ئێمە بۆلای تۆ نەهاتوین، ئەوجا پێشەوا عمر بێدەنگ بوو، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا خۆت بەدەستی خۆت بیڕوخێنە ئێمە ناتوانین! ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا بە بەرچاوی خەڵکەکەوە روخاندیان و ژن و منداڵ هەمووی بۆی دەگریان.

* موسڵمانەکان دەوڵەتی ئیسلامی درووست دەکەن:

لە(٢٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٩٢ ك) بەرامبەر (١٨)ی تەموزی ساڵی (٧١١ ز) شەڕی (وادی رباط) (شذونة) لە نێوان موسڵمانەکان بە سەرۆکایەتی (طاریق ی کوڕی زیاد ) و سوپای ئیسپانیەکان (القوط) بە سەرۆکایەتی (لذریق)، شەڕەکە ماوەی (٨) ڕۆژی خایاند و لەئەنجامدا (لذریق) لە ئاودا خنکا،ئەوە بوو موسڵمانەکان توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن و ئەمەش بووە ڕێخۆشکەرێك تاموسڵمانەکان بتوانن نوری ئیسلام بگەیەننە ئیسپانیا و بۆماوەی (٨) سەدە دەوڵەتی ئیسلامی تێیدا بەڕێوە بەرن.







*** محمد علی جناح دەبێتە دەسەڵات داری پاکستان:**

لـە (٢٨)ی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٣٦٩ك) بەرامبەربـە (١٥)ی ئـابی سـاڵی (١٩٤٧ز) محمد علی جناح – دەسەڵاتی پاکستانی گرتە دەست دوای ئـەوەی کە پاکستان لە هندستان جیابویەوە.

*** (ابومنصور نزار) ناسراو بە (العزیزبالله) وەفاتی کرد.**

لە (٢٨)ی ڕەمەزانی ساڵی (٣٨٦ ك) بەرامبەر بە (١٤)ی تـشرینی یەکـەمی ساڵی (٩٩٦ ز) – (ابومنصور نزار) العزیز بالله وەفـاتی کـرد. ابـو منـصور لەتەمەنی (٢٢) ساڵی دا لە دوای بـاوکی (المعزلـدین اللـه) دەسـەڵاتی گرتـە دەست و هەرلەسەر شێوازی باوك و باپیرانی دەڕۆشت لە بەڕێوەبردنی دەسەڵات دا. لە ڕووی کەسایەتی یەوە کەسێکی قسەخۆش و لەسەرخۆ و نـەرم ونیـان و بەخشندە و زیرەك و قسەزان بوو، زۆر گرنگی بە ڕاوکردن دەداو لە ڕووی زمان زانینیشەوە چەندین زمانی دەزانی، گرنگی زۆر بەشتی جوان و تایبـەت دەدا، تەنانەت جۆرێك لە (مێزەر) (عەمامە)ی داهێنابوو کە بە دەزووی زێڕ چنرابوو. لە ڕووی مەزهەبیەوە گرنگی زۆری بە مەزهەبی (ئیسماعیلی) شیعەکان دەداو داوای لە قازیەکان دەکرد کە حوکمەکانیان بـەپێی ئـەو مەزهەبـە دەربکـەن و داوای لە موسڵمانەسوننەکان دەکرد و دەیگوت ئەگەر بەو حوکمانـە ڕازی نـین کارەکانتان بەجێ بهێڵن وواز بهێنن، جگەلەوەش چەندین شـیعەی لـە پۆسـتە سەرەکی یەکانی حکومەتدا دامەزراند بوو، لە هەمان کاتدا چەندین مزگەوتی تەرخان کردبوو بـۆ بڵاوکردنـەوەی مەزهـەبی ئیـسماعیلی، بـۆ ئەومەبەسـتە مزگەوتی (ئەزهەر)ی کردە زانکۆ کە تێیـدا (فقـە)ی مەزهـەبی ئیـسماعیلی دەخوێندرا و چەندین گەورە زانای تەرخان کردبوو بۆ بڵاو کردنـەوەی فیکـرەی





شیعە گەرایی، جگە لەوەش هەوڵی تەواوی دەدا بۆ دروستکردنی بۆنەو دروشمی شیعەگەرایی ئەوەبوو لەوماوەیەدا توانی لە بانگداندا (حی علی خیر العمل) زیاد بکات و ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی ڕۆژی عاشورا درووست بکات و نوێژی تەراویح لە گشت مزگەوتەکانی میسر قەدەغە بکات، لە لایەکی تریشەوە جولەکە و مەسیحیەکانی لە دەسەلات نزیك دەکردەوە و زۆرێك لە پۆستە بالآو هەستیارەکانی پێ دابوون، لە ناودارترین وەزیرەکانی مەسیحی و جولەکەکان:

١- یعقوبی کوڕی کِلّس - وەزیر.
٢- عیسی ی کوری نسگورس - وەزیر.
٣- ابوالفتح منصوری کوری مقشر المصری - دکتۆری تایبەتی سولتان.
٤- منشاءی کوڕی ابراهیم الفراری یەهودی - والی شام.

ئەو کەسەی کە شەوی بیست و هەشتی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، پاداشتی وەکو پاداشتی حەزرەتی (ئەیوب) پێغەمبەرە (ﷺ)، لەبەرامبەر ئەو ناخۆشی و نەخۆشیەی کە توشی هات و خوای گەورە ئەوی پێ تاقی کردەوە...

(پێشەوا علی)



دوعای ڕۆژی بیست و نۆیەمی مانگی ڕەمەزان:

**اللهم غشني فيه (في رمضان) بالرحمة، وارزقني فيه التوفيق والعصمة، وطهر قلبي من غياهب التهمة، يا رحيما بعباده المؤمنين.**



**ی**

**ڕەمەزان**

*** ڕزگارکردنی دورگەی (مالتە):**

**لە ٢٩ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٢٥٦ك) بەرامبەر بە ٢٩ی ئابی ساڵی (٨٧٠ز) موسڵمانان توانیان دورگەی (مالتە) ڕزگار بکەن کە دەکەوێتە دەریای سپی ناوەڕاست.**

*** شاری دیمەشق داگیر دەکرێت:**

**لە (٢٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٢ك) بەرامبەر بە (١٠)ی ئازاری ساڵی (٧٥٠ز) پایتەختی ئەمەویەکان کە شاری (دیمەشق) بوو لەلایەن هێزەکانی سوپای عەبباسیەکان دەستی بەسەردا گیرا بە سەرۆکایەتی (عبدالله ی کوڕی علی).**

*** زەکات واجب دەبێت:**

**لە (٢٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢)ی کۆچی بەرامبەر (٢٤)ی ئازاری ساڵی (٦٢٤ ز) زەکاتی سەرفیترە و زەکاتی گشت بەشەکانی وەکو زێڕو زیو و دەغڵ ودان و ماڵ و مەڕوماڵات فەرزکرا و نوێژی جەژنیش دانرا، هەر لەو مانگەش دا فەرمان کرا بە موسڵمانان کە جیهاد بکەن لە دژی کافراندا.**




* شاری قەیرەوان درووست دەکرێت:

لە(٢٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٤٨ ك) بەرامبەر (٩)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٦٦٨ز) (عەقەبەی کوڕی نافع) داوای کرد کە شاری (قەیرەوان) دروست بکرێت، تا ببێتە بەربەستێکی بەهێز لەبەردەم هێرشی دوژمنکارانەی ڕۆمەکان و خاچ پەرستەکاندا.

* شکستی تەتارەکان:

لە (٢٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٩٩ ك) بەرامبەربە (١٧)ی حوزەیرانی ساڵی (١٣٠٠ ز) روداوی (الخازندار )ی ناسراوبە (مرج الصفر) رویدا کە سەرکردە (احمد الناصری کوڕی قەلاون) توانی تەتارەکان ببەزێنێت.

* گەنجێکی موسڵمان گەشتێك بۆ بۆشایی ئاسمان ئەنجام دەدات:



لە (٢٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٠٥ ك) بەرامبەربە (١٧)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٨٥ز) ئەمیر(سوڵتانی کوڕی سلمان) گەنجی وڵاتی سعودی توانی گەشتێکی یەك

هەفتەیی بکات بۆ بۆشایی ئاسمان. ئەو گەنجە موسڵمانە لە سعودیە لە ساڵی (١٩٥٦ ز) لەدایك بووە و لە ناو هێزە ئاسمانیەکاندا کاری کردووە، شایانی باسە کەسێکی خێرخوازو کۆمەڵایەتی بوو.

* دووبارە هەڵسانەوەی موسڵمانان:

لە (٢٩)ی ڕەمەزانی (٢٦)ی تشرینی دوەمی ساڵی (٦٣٤٠ ز) لەسەردەمی خەلافەتی پێشەوا (عمری کوری خەتاب)، سوپای موسڵمانان بە سەرۆکایەتی (مثنی ی کوری حارثه) سەرکەوت بەسەر فارسەکاندا لە شەڕ ی (البیوب)ی خاکی عێراق دا، ئەم سەرکەوتنە هێزی موسڵمانەکانی بەدەرخستەوە لە دوای ئەو شکستەی کە لە شەڕی (الجسر) لە بەرامبەر فارسەکان بەسەریان هات.

ئەو کەسەی کە شەوی بیست و نۆی مانگی ڕەمەزان بە کردنی نوێژی تەراویح زیندو دەکاتەوە، خوای گەورە گوناه و تاوانەکانی سیڕ دەکات و دای دەپۆشێ لە دونیا و دوارۆژدا...
(پێشەوا علی)

یەکەم جار مێژوی وڵات و میللەتی خۆت بزانە، دواتر مێژوی ئەوانی تر بخوێنەوە.
(وتە)

**دوعای رۆژی سی یەمی مانگی رەمەزان:**

**اللهم اجعل صيامي فيه (في رمضان) بالشكر و القبول على ما ترضاه و يرضاه الرسول محكمة فروعه بالاصول، بحق سيدنا محمد واله الطاهرين، والصحابة اجمعين، والحمد لله رب العالمين.**



**ی**

**رەمەزان**

*** (١٠٠) ساڵ تەمەن لە تێکۆشاندا:**

**لە (٣٠)ی رەمەزانی ساڵی (٤٣ ك) بەرامبەر (٦٦٤ ز) پێشەوا (عمرو ی کوڕی عاص) لەتەمەنی (١٠٠) ساڵیدا وەفاتی کرد.**

*** پێشەوا (بخاری) وەفاتی کرد:**

**لە (٣٠)ی رەمەزانی ساڵی (٢٥٦ ك) بەرامبەر (٣١)ی ئەیلولی ساڵی (٨٦٩ ز) (محمدی کوڕی ئیسماعیل کوڕی ابراهیم کوڕی مغیرە) ناسراو بە پێشەوا بخاری وەفاتی کرد، کە خاوەنی (صحیح البخاری) و (التاريخ الكبير) و (الادب المفرد)ە.**

*** ابن حزم لەداك بوو:**

**لە (٣٠)ی رەمەزانی ساڵی (٣٨٤ ك) بەرامبەر (٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٩٩٤ز) پێشەوای گەورە (محمدی کوڕی علی کوری احمدی کوری سعیدی ناسراو بە ابن حزم) لەدایك بوو. کە یەکێك بوو لە ناودارترین زانا موسڵمانەکانی**









سـەدەی (٥)ی کۆچـی. خـاوەنی چـەندین کتێبـی فیقهـی و مێـژوویی و بەراوردکردنی دینەکان و..هتد)یە.

کاتێك کە شەوی سیەمی مانگی رەمەزان دێـت خـوای گـەورە ئەمر بە بانگەواز کارێك دەکات تا لـە ئاسمانەکانـەوە بانگـەواز بکات و بڵێ : ئەوانەی کە شەوانی مانگی رەمەزانیان بە نوێژی تەراویح و عیبادەت زیندو کردەوە خوای گـەورە بڕیـاری داوە لە سزای خۆی بیان پارێزێ و رزگاریان بکـات. پاشـان خـوای گـەورە ئـەمر دەکـات بـۆ هەریەکـەیان دوو پاکانـە بنووسـن، پاکاندیەکیان لـە ئاسان پەڕینەوە بەسەر پردی سیرات (الـصراط) و پاکانەکەی تریشیان بۆ رزگار بورن لـە ئاگری دۆزەخ. پاشان پێشەوا عەلی وتـی: بێگومـان مـانگی رەمـەزان مـانگی ئوممـەتی محمدە (ﷺ) خۆشی و خەنی لەو کەسەی کە خوای گەورە بە رۆژو بوون و عیبادەتی ئەو مانگە پیرۆزەی بەنسیب دەکات.

(پێشەوا علی)





لەم کتێبەدا باس لە :

گرنگترین ئەو ڕووداوە خۆش و ناخۆشە مێژووییانە کراوە کە لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا ڕوویان داوە، جگە لەوەش ئامارە بە زۆرێك لەو کارەسات و مەینەتیانەش کراوە کە بەسەر میللەتی کوردی موسڵماندا هاتووە و هاوکات بووە لەگەڵ مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا.